


چاپی دووەم

# بەرلەوەی قاوەکە سارد ببێتەوە

توشیکازو کاواگیچی
لە ئینگلیزییەوە: ساکار حسێن

# بەرلەوەی
# قاوەکە سارد ببێتەوە

توشیکازو کاواگیچی

لە ئینگلیزییەوە: ساکار حسێن

GOLDEN BOOK
Warzer Book

ناوی کتێب: بەرلەوەی قاوەکە سارد ببێتەوە
بابەت: ڕۆمان
نووسەر: توشیکازو کاواگیچ
وەرگێڕ: ساکار حسێن
پێداچوونەوە: سیروان سلێمان
دیزاین: هەرێم عوسمان
قەبارەی کتێب: ١٣سم * ٢١سم
چاپ: چاپخانەی چوارچرا
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
نورەی چاپ: چاپی یەکەم
ساڵی چاپ: ٢٠٢٣ ز

لە بەڕێوەبەرێتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (١٢٧٥) ی ساڵی ٢٠٢٣ ی پێدراوە



کتێبخانەی **گۆڵدن بووک**
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
07701598762 - 07501444434
Golden book · ktebfroshe_warzer
Warzer Book · Ktebfroshe_warzer




Description

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و بابەتی جیاواز🤍

ئەم کتێبە لەلایان سارا نامیق کراوە بەpdf
پێویستی بە دوعایە دوعای خێری بۆ بکەن

چەنال
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7

له یەکێک لە کۆڵانە تەنگەکانی شاری تۆکیۆدا قاوەخانەیەکی خنجیلە هەبوو، کە زۆر بە ناوازەیی خزمەتی کڕیارەکانی دەکرد، زیاد لە سەد ساڵە بەشێکی خەڵکەکە لەبەرئەوە سەردانی قاوەخانەکە دەکەن تاکو گەشتی کات ئەنجام بدەن.

لە پەرتوکی "بەرلەوەی قاوەکە ساردبببێتەوە" چوار سەردانیکەرمان هەیە. هەر یەکێکیان بۆ مەبەستێکی جیاواز دەگەڕێنەوە ڕابردوو، یەکەمیان بۆ دڵنیابوونە لە بەڵێنی خۆشەویستەکەی، دووەمیش بۆ وەرگرتنی نامەیەک لە خۆشەویستەکەی، سێیەمیش بۆ بینینەوەی خوشەکەکەی، کۆتا دانەش بۆ زانینی شانسی لەدایکبوونی ئەو کچەیان کە ڕوون نییە دێتە دونیا یاخود نا.

بەڵام گەشتەکەیان بەبێ مەترسی بەڕێوەناچێت بێگومان؛ کڕیارەکان دەبێت لەسەر کورسییەکی دیاریکراو دابنیشن، نابێت جێیبهێڵن. لە کۆتایشدا دەبێت بگەڕێنەوە ئێستایان بەرلەوەی قاوەکە ساردببێتەوە...

فلیمەکەی توشیکازو کاواگوچی دوو پرسیاری نایاب لە مێشکدا دەوروژێنێت، ئەگەر بگەڕێیتەوە ڕابردوو دەتەوێت کێ ببینیت؟ بۆ چ مەبەستێک دەتەوێت بیبینیت؟

ڕۆمانێکە دوای خوێندنەوەی توشی تێڕامانێکی قوڵت دەکات لەسەر ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو، بەڵام پێت دەڵێ؛ گرنگترین سەرمایەی تۆ ئێستایە بەو کەسانەوە کە لە دەورتن و بیانپارێزە، چونکە دواتر حەسرەتی زەردەخەنەیەک بە ڕویاندا دڵت وێران دەکات.

ئەگەر بگەڕێیتەوە ڕابردوو، دەتەوێت کێ ببینیت؟

## ناوەڕۆک

## کارەکتەرەکانی پەرتوکەکە

کازوو: گارسۆن و ئامۆزای ناگاری

خاتوونە کراس سپییەکە: ئەو خاتوونەیە کە لەسەر کورسییەکە دانیشتووە

ناگاری: خاوەنی قاوەخانەکە

کی: هاوسەری ناگاری

فۆمیکۆ: خۆشەویستی گۆرۆیە

گۆرۆ: خۆشەویستی فۆمیکۆیە کە دەچێت بۆ ئەمەریکا

هیرای: خاوەنی بارەکەیە

کومی: خوشکی هیرایە

فوساجی: یەکێکە لە کڕیارەکان و تووشی زەهایمەر بووە

کۆهتاکی: هاوسەری فوساجییە

کومی: کچی ناگاری و کییە

# I
# خۆشەویستەکان

پیاوەکە بە دەم ورتەوە هەستایە سەرپێ و جانتاکەی بەدوای خۆیدا ڕاکێشا.

گوڕۆ؛ "ئای خودایە، کات چەندە؟ ببورە، دەبێت بڕۆم."

ژنەکە گوتی؛ "ئێ؟"

ئافرەتەکە هێشتا لە بابەتەکە تێنەگەیشتبوو، چونکە پێی وانەبوو خۆشەویستەکەی بۆ ئەوە بانگی کردبێت کە پەیوەندییە سێ ساڵە جدییەکەیان کۆتایی پێبهێنێت... لەو کاتەدا پیاوەکە گوتی کە دەیەوێت بڕوات بۆ ئەمەریکا، فڕۆکەکەی چەند کاتژمێرێکی تر دەفڕێت بەرەو ئەوێ. لەم کاتەدا بەبێ ئەوەی ئافرەتەکە پرسیار بکات تێگەیشت کە گفتوگۆ جدییەکەیان دەربارەی جیابوونەوەیە. لەو ساتەدا درکی بەوە کرد بە هەڵە هیوای بە بابەتەکە هەبوو، چونکە لە مێشکی خۆیدا بەو هیوایە ڕۆیشتبووو کە خۆشەویستەکەی پێی بڵێت؛ "شووم پێدەکەیت؟" بۆ نموونە.

"چی؟" پیاوەکە بەبێ ئەوەی سەیری ناو چاوی بکات وای گوت.

ئافرەتەکە پرسی؛ "باشە من شایەنی ئەوە نیم ڕوونکردنەوەم بۆ بدەیت؟"

پیاو و ئافرەتەکە لە ناو قاوەخانەیەکی بێپەنجەرە دانیشتبوون، ئافرەتەکە بە تۆنێکی خەمبارانەوە قسەکەی کرد کە پیاوەکە هیچ کات حەزی لەو جۆرە نەبوو.

قاوەخانەکە تەنها بە چەند گڵۆپێک ڕووناک ببۆوە، بەبێ ئەوەی تروسکایی ڕووناکییەک بێتە ژوورەوە، تەنانەت هیچ کاتژمێرێکیش بە دیواری ژووری قاوەخانەکەوە نەبوو، بۆیە ئەگەر لەوێ دانیشتیتایە ئەستەم بوو بزانیت شەوە یاخود ڕۆژە .

تەنها سێ کاتژمێری گەورەی کۆن بە دیواری قاوەخانەکە هەڵواسرابوو کە هەریەکێکیان کاتژمێرێک بوو مرۆڤ نەیدەزانی کامەیان کاتە ڕاستەکەی ئێستایە، یاخود ئەو کاتژمێرانە لە کار نەکەوتوون؟

ئەو کەسانەی کە تازە دەهاتنە ناو قاوەخانەکە دەبوو تەماشای کاتژمێرە دەستییەکانی خۆیان بکەن تاکو بزانن کاتژمێری ڕاست چەندە، پیاوەکە هەمان کاری ئەنجام دا، دواتر برۆیەکی هەڵتەکاند و لێوی خۆی گەست.

ئافرەتەکە توانی ڕەفتاری داهاتووی پێشبینی بکات.

ئافرەتەکە گوتی؛ "بۆچی بەم جۆرە ڕەفتار دەکەیت؟ وەک ئەوەی تەنها من هۆکاری ئازارت بم؟"

پیاوەکە بەبێ ئەوەی هیچ بڵێت تەنها لێوی خۆی دەگەست.

ئافرەتەکە گوتی؛ "کەواتە دەتویست من یەکەم کەس بم ئەوە بڵێم؟"

دواتر دەستی برد بۆ قاوەکەی و خواردییەوە بە دەنگێکی خەمناکەوە. پیاوەکە دووبارە تەماشای کاتژمێرەکەی کردەوە، وا پێدەچوو کاتی ڕۆیشتنی هاتبێت لە قاوەخانەکە.

پیاوەکە تا دەهات دڵەڕاوکێکەی زیاتردەبوو، ژنەکە کوپە قاوەکەی دانەیەوە سەر مێزەکە. زرم!

پیاوەکە هەستایەوە سەرپێ هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژییەوە، دووبـارە دەستی بە قژیدا هێنا، پاشان دانیشتەوە لەسەر کورسییەکە، بە هێمنی تەماشای دەمووچاوی ژنەکەی دەکرد. ژنەکەش بە هێمنی دانیشتبوو دەستی لەسەر کۆشی دانابوو، لە پیاوەکەی دەڕوانی وەک ئەوەی هیچ شتێک ڕووی نەدابێت..

پیاوەکە کە پێشتر پەلەی بوو ئەمجارە هیچ بە پەلە نەبوو، بە ئافرەتەکەی گوت؛ "تەماشا بکە ..."

پـیـاوەکـە هـیـچـی تـری نـەگـوت، ئـەمـجـارە سـەرقـاڵـی خۆکۆکردنەوەش نەبوو، ئافرەتەکە سەری داخست بەبێ ئەوەی بۆ یەکجاریش تەماشای بکات پێی گوت؛ "بۆچی ناڕۆیت؟ کاتی نەهاتووە بڕۆیت؟"

ئافرەتەکە کە پێشتر داوای ڕوونکردنەوەی دەکرد ئەمجارە ڕەتیکردەوە وابڵێت، پیاوەکە بە سەرسامییەوە تەماشای دەکرد، دەبێت ئافرەتەکە مەبەستی چی بێت!

ئافرەتەکە سەری هەڵبڕی تەماشای پیاوەکەی دەکرد، تەنها بە هێمنیەوە سەرنجی دەدا و هیچی تر، پیاوەکە لە کورسییەکەی هەستایەوە و چووە لای ژمێریارەکە، بە نەرمی پێی گوت؛ "دەمەوێت پارەکە بدەم."

ژنەکە دەستی پیاوەکەی گەڕاندەوە و پێی گوت؛ "من کەمێک زیاتر دەمێنمەوە بۆیە من پارەکە دەدەم."

پیاوەکە گوێی بە قسەی ئافرەتەکە نەدا پارەکەی دا بە ژمێریارەکە؛ "پێکەوەین."

ئافرەتەکە؛ "ئۆو، پێ گوتیت وازی لێبێنە."

پیاوەکە بەبێ گوێدانە ئافرەتەکە هەزار یەنی لە جزدانەکەی دەرهێنا؛ "زیادەکەی هەڵبگرە" پاشان پارەکەی دا بە ژمێریارەکە. دواتر پیاوەکە جانتاکانی کۆکردەوە و بەخەمباری قاوەخانەکەی جێهێشت و ڕۆیشت.

## تەق–تەق

فۆمیکۆ کیاکاوە؛ "ئەم ڕووداوە هەفتەیەک بەر لەئێستا ڕوویدا."

کوپەکەی دانایەوە سەر مێزەکەی، تەواوی کڕیار و گارسۆنەکان گوێیان لە چیرۆکەکەی فۆمیکۆ گرتبوو.

فۆمیکۆ پێش ئـەوەی قۆناغی دوانـاوەنـدی تـەواو بکات شەش زمانی دەزانی، دواتریش توانیبووی پلەی یەکەم لەسەر ئاستی زانکۆی واسیدا بەدەست بهێنێت، دواتر توانی لەگەڵ گروپی تەکنەلۆژی پزیشکی کاربکات لە تۆکیۆ، لە دووەم ساڵی کارکردنەکەیدا بە ئاسانی لەگەڵ گروپی پرۆژەی دەماریدا کاری دەکرد، ئافرەتێکی بەهێز و زیرەک بوو لە بوارەکەی خۆیدا.

ئەمڕۆ فۆمیکۆ جلوبەرگی کاری لەبەردایە، کە لە تەنوورە و چاکەتێکی ڕەش و کراسێکی سپی پێکهاتووە، بەپێی جلوبەرگەکەی بێت لە کارەوە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ.

فۆمیکۆ لەناو ئەو جل و بەرگەی دەدرەوشایەوە، جووتێک پێڵاوی ڕەشـی نـووک باریکی لەپێدا بوو کە زیاتر شێوەی وەکو نمایشکارەکان دەردەکـەوت، هـەر کەسێک بیبینیایە پێی سەرسام دەبوو، چونکە خانمێک بوو تێکەڵ لە جوانی و زیرەکی.

فۆمیکۆ لە ڕابـردوودا بیرکردنەوەی بـەم جۆرە نەبوو، چونکە لە ڕابـردوودا ئـەوەی بیری لێدەکردەوە تەنها خۆی بۆ کارکردن تەرخان کردبوو، بـەڵام ئـەوە ئـەوە ناگەیەنێت هەرگیز لە خۆشەویستیدا نەبووبێت، نەخێر. بەڵکو گرنگی زیاتر بەکارەکەی دەدات، چونکە هەمیشە دەیگوت؛ "کارەکەم خۆشەویستی منە."

وەکو خۆی دەڵێت چەندان پیاوی تاقیکردۆتەوە، بەڵام لە کۆتایدا کارەکەی بۆ ماوەتەوە.

ئەو پیاوەی لە سەرەتاوە فۆمیکۆ قسەی لەبارەوە دەکرد گۆرۆ کەتادا بوو، کە ئەندازیاری سیستەمە وەکو فۆمیکۆ لە کۆمپانیایەکی بواری پزیشکی کار دەکات، دواتر بووەتە خۆشەویستی فۆمیکۆ دووساڵ بەر لە ئێستا، لەوکاتەی سەرقاڵی ئامادەکردنی پرۆژەیەک بوون بەهاوبەشی بۆ یەکێک لە کڕیارەکان.

هەفتەی پێشوو گۆرۆ داوای لە فۆمیکۆ کرد کە یەکتر ببینن و لەسەر بابەتێکی گرنگ قسەبکەن، فۆمیکۆ بە عەزییەکی پەمەیی گوڵ گوڵی سپی و قاپوتێکی بێجییەوە گەیشتە قاوەخانەکە، سەرنجی تەواوی ئەو پیاوانەی ڕاکێشابوو کە بەلایاندا تێپەربووبوو، چونکە ئەم شێوازە دەرکەوتنەی بۆ فۆمیکۆ زۆر تازە بوو، فۆمیکۆ هەمیشە بە جلوبەرگی فەرمییەوە دەردەکەوت، هەر بەوەش ناسرابوو تەنانەت لەو کاتانەشی کە دەچووە ژووان لەگەڵ گۆرۆ هەر قاتی دەپۆشی، چونکە زۆربەی کات لەسەر کار یەکتریان دەبینی.

لەبەر ئەوەی گۆرۆ گووتبووی بابەتەکە گرنگە بۆیە فۆمیکۆ بەتایبەت جلی کڕیبوو خۆی ئامادەکردبوو بۆ بینینی گۆرۆ.

هەردووکیان گەیشتنە قاوەخانەکەی کە دایاننابوو لێی یەکتر ببینن، بەڵام قاوەخانەکە داخرابوو، ئەوانیش دڵتەنگ بوون بە بابەتەکە، چونکە ئەوێ جێیەکی بێدەنگ بوو، دەیانتوانی بە ئاسانی قسە تایبەتەکانیان بکەن.

بە ناچاری شوێنەکەیان بەجێهێشت، دەبوو جێیەکی تر بدۆزنەوە، لە ناوەڕاستی شەقامەکە قاوەخانەیەکی تری بچکۆلەیان دۆزییەوە، چونکە پێشتر نەچووبون بۆ ئەو جێیە، هیچ بیرۆکەیەکیان نەبوو ئاخۆ دەبێت لە ناوەوە چۆن بێت دیمەنەکە، ناوی قاوەخانەکە لە شیعری یەکێک لە گۆرانییەکان دەچوو کە پێشتر فۆمیکۆ گوێی لێگرتبوو.

دوای ئەوەی چوونە ناو قاوەخانەکە، جێیەکە زۆر لەوە بچووکتر بوو کە چاوەڕێیان دەکرد، تەنها جێی نۆ کڕیار دەبۆوە، سێ کورسی لێبوو لەبەردەم مێزی ژمێریارەکە لەگەڵ دوو مێزی جیاواز.

بەتەواوی "بابەتێکی گرنگ" لە مێشکی فۆمیکۆ چووە دەرەوە، چونکە شوێنەکە بەجۆرێک بوو دەبوو بە چپە قسە بکەن، یەکێکی تر لە شتە خراپەکان ئەوە بوو کە گڵۆپەکانی قاوەخانەکە زۆر کزبوون ...

لە جێیەک دەچوو بۆ ڕێککەوتنە نادیارەکان...

بە ترسەوە فۆمیکۆ چووە ناو قاوەخانەکە، لە کورسییە بەتاڵەکە دانیشت، قاوەخانەکە تەنها گارسۆن و سێ کڕیاری تری لێبوو، لە مێزێکیان ژنێک دانیشتبوو کە عەزییەکی سپی لەبەردا بوو پەرتووکێکی بە دەستەوە بوو دەیخوێندەوە.

لەولاتر پیاوێک دانیشتبوو تێنوسێکی بچووکی لە دەستبوو کە شتی تێدا دەنووسییەوە.

ژنێکی تریش لەلای کاشێرەکە دانیشتبوو کە بلوسێکی سوور و پانتۆڵێکی سەوزی لە پێدابوو، چاوی لەسەر فۆمیکۆ لانەدا تاکو لەسەر کورسیەکەی دانیشت، دواتر سەرنجی لەسەر قسەکانی گۆرۆ و فۆمیکۆ بوو ئاخۆ چی دەڵێن، دواتر بانگی گارسۆنەکەی کرد، بە چاو پێی گوت کە تەماشایان بکات باسی چی دەکەن.

بەپێی دەربڕینەکانی فۆمیکۆ ژنەکە گوتی؛ "ئەوەی من دەیبینم ئەوەیە... "

لەڕاستیدا ژنەکە هیچی نەدەبینی، تەنها بە تەماشاکردنی فۆمیکۆ بڕیاری لەسەر شتەکان دەدا، ژنەکە ناوی یایکۆ هیرای بوو، ژنەکە لە سییەکانی تەمەنیدا بوو قاوەخانەکە ببووە جێی هەمیشەیی ئەو، پێش کارکردن دەهاتە قاوەخانەکە قاوەیەکی داوا دەکرد.

جلەکانی زۆربەی کات لە یەک دەچوو، بەڵام ئەمڕۆ بە شێوازێکی زۆر جیاواز هاتبوو بۆ قاوەخانەکە، هیرای قاچی لەسەر قاچ دانابوو، گوێی شلکردبوو بۆ قسەکانی فۆمیکۆ.

**تەق-تەق**

فۆمیکۆ؛ "ئەوەی تۆ باسی دەکەیت هەفتەیە پێش ئێستا بوو، بیرت دەکەوێتەوە؟"

فۆمیکۆ سەری هەڵبڕی و بانگی گارسۆنەکەی کرد؛ "هممم...بەڵێ".

گارسۆنەکە بەبێ ئەوەی سەر هەڵبڕێ و تەماشای دەموچاوی فۆمیکۆ بکات وەڵامی دایەوە.

گارسۆنەکە ناوی کازوو تۆکیتا بوو، ئامۆزای سەرکاری (خاوەنی قاوەخانەکە) بوو، کازوو کاری لە قاوەخانەکە دەکرد وەکو گارسۆن، لە هەمان کاتدا خوێندکاری بەشی هونەر بوو لە زانکۆی تۆکیۆ. کازوو دەموچاوێکی پان و ڕوومەتێکی خڕ و دوو چاوی بچووکی هەبوو، دەموچاوی لەو جۆرە کەسانە بوو کە تاک بوون، هەر بۆیە کاتێک چاوت دابخستایە و بتویستایە وێنای بکەیت ئەستەم بوو بیرت بێتەوە دەموچاوی چۆن بووە، کازوو هاوڕێی کەم بوو، چونکە تا ڕادەیەک کەسێکی داخراوبوو.

هیرای پرسیاری کرد؛ "ئەی چی دەربارەی ئەو؟ ئێستا لە کوێیە؟" دەستێکی بە کوپەکەوە بوو یاری پێدەکرد لەنێو دەستەکانی ئەو قسەیەی کرد، بەڵام بەبێ ئەوەی وەها دەربکەوێت بەلایەوە گرنگە یاخود نا.

فۆمیکۆ بە هەناسە هەڵکێشانەوە گوتی؛ "ئەمەریکا".

هیرای گوتی؛ "کەواتە خۆشەویستەکەت ئەوەی هەڵبژارد کە بچێت لە ئەمەریکا کار بکات؟"

فۆمیکۆ بە ناڕازەییەوە گوتی؛ "نا ئەوە ڕاست نییە!"

هیرای؛ "ئێ تۆ وا بڵێ، بەڵام ئەوەی ڕاستە ئەوەیە کە ئەو چوو بۆ ئەمەریکا، ئەی مەگەر وانییە؟"

فۆمیکۆ؛ "تۆ هیچ تێنەگەیشتی لەوەی کە گوتم؟"

"دەمویست پڕ بە قورگم هاوار بکەم بڵێم مەڕۆ، بەڵام لە هەمان کاتدا من زۆر خۆشحاڵ بووم بەوەی کە بڕوات."

هیرای هەندێک چەرەساتی هەڵدایە ناو دەمییەوە و گوتی؛ "جوان دانت پێدانا، چونکە هەموو ئافرەتێک ئەو کارە ناکات."

فۆمیکۆ قسەکەی ئاراستەی کازوو کرد بە ئومێدی پشتگیری؛ "تۆ تێگەیشتیت وایە؟"

کازوو کەمێک بیری کردەوە، پاشان گوتی؛ "تۆ گوتت ناتەوێت بچێتە ئەمەریکا وایە؟"

کازوو یەکێک بوو لەو کەسانەی بێ پێچوو پەنا دەچووە ناو بابەتەکە.

"باشە...ئێ من.... نا وا نا بەڵام..." چونکە بەم قورسییە فۆمیکۆ وەڵامی دایەوە هیرای گوتی؛ "بەڕاستی قورسە لێت تێبگەین."

ئەگەر هیرای لەجێی فۆمیکۆ بوایە ڕاستەوخۆ دەستی دەکردە گریان و دەپاڕایەوە؛ "تکایە مەڕۆ!" چونکە هیرای شارەزا بوو لە فرمێسک ڕشتندا.

فۆمیکۆ ڕووی کردە کازو گوتی؛ "تکایە بمگەڕێنەوە ئەو ڕۆژەی ... بمگەڕێنەوە هەفتەیەک پێش ئێستا".

پێش ئەوەی کازوو وەڵام بداتەوە هیرای هەڵیدایە؛ "چی تۆ دەتەوێت بگەڕێیتەوە ڕابردوو"؟! ڕووی کردە کازوو گوتی؛ "ئەو دەیەوێت بگەڕێتەوە ڕابردوو.

کازوو بە ئاسایی وەڵامی دایەوە؛ "ئۆو...."

چەندین ساڵ تێپەڕبووە بەسەر ناوبانگی قاوەخانەکەدا، کە پێی دەڵێن قاوەخانەی گەشتی کات، یاخود قاوەخانەی ئەفسانەکە، کە خەڵک پێیان وایە لەم جێیەدا دەتوانن بگەڕێنەوە ڕابردوو، دوای چەند ڕۆژێک فۆمیکۆ ئەو قسەیەی لە مێشکی سڕیبویەوە دەربارەی قاوەخانەکە، شەو داهات تەماشای بەرنامەی تەلەفیزۆنی دەکرد، باسی شوێنە داخراوەکانی دەکرد بەرنامەکە، لەو ساتەدا فۆمیکۆ قاوەخانەکەی بیرکەوتەوە کە ناونیشانەکەی بەو جۆرەیە دەتگەڕێنێتەوە ڕابردوو، بیرکردنەوە لە بابەتەکە ئاڵۆز بوو، بەڵام هێشتا یادەوەرییەکی نائاسایی بوو بۆ فۆمیکۆ.

ئەگەر بگەڕێمەوە ڕابردوو، ڕەنگە بتوانم هەندێک ڕووداو چاک بکەمەوە. دەتوانم لەگەڵ گۆرۆ جارێکی تر قسە بکەم.

ئەم قسەیە لە مێشکیدا دووبارە و دووبارە دەبویەوە، بەردەوام، بەجۆرێک نەیدەتوانی بیر لە شتێکی تر بکاتەوە.

ڕۆژی دواتر چووە سەرکارەکەی، بەڵام بە تەواوی لە بیری کرد نانی بەیانی بخوات، لەوەش زیاتر هیچ بیری لای ئیشەکەی نەبوو، تەنها دانیشتبوو کاتی لەوێ بەسەر دەبرد.

تەواوی کارەکانی ئەو ڕۆژەی پڕبوون لە هەڵە و کەموکورتی، بەڵام فۆمیکۆ هیچ پێیانەوە سەرقاڵ نەبوو، تەنانەت هاوکارەکەی لە بارودۆخی پرسیبوو، بەڵام ئەو ڕەتی کردەوە بۆی باس بکات کێشەی چییە.

بەتەواوی سی خولەکی پێویست بوو تاکو بە شەمەندەفەر لە کۆمپانیاکەوە بچێت بۆ قاوەخانەکە، بە هەناسە برکێ خۆی گەیاندە قاوەخانەکە، ڕاستەوخۆ چووە لای کازوو.

"تکایە بمگەڕێنەوە ڕابردوو!"

ڕاستەوخۆ ئەو ڕستەیەی لە دەم هاتە دەرەوە پێش ئەوەی کازوو وەلامی سڵاوەکەشی بداتەوە.

کازوو بە سەرسامی تەنها لە فۆمیکۆی دەڕوانی، بێ ئەوەی هیچ قسەیەک بکات، هیرایش سەری سوڕمابوو لە بارودۆخەکە.

ئەو کەسانەی کە دەیانزانی بەو جۆرە گەشتی کات هەیە لە قاوەخانەکە تەنها کازوو، هیرای، خاتوونە کراس سپییەکە و پیاوەکە بوو کە تێنوسەکەی بەدەستەوە بوو. واتە هەمان ئەو دەمووچاوانەی هەفتەی پێشوو. بەنیگەرانییەوە فۆمیکۆ پرسی؛ "دەتوانم بگەڕێمەوە ڕابردوو وایە؟"

ڕەنگە واباشتر بووبێت بەو پرسیارە دەستی پێکردبێت، بەلام تازە درەنگ بوو. دووبارە پرسی؛ "دەکرێت یاخود نا؟"

کازوو؛ "هممممم ئە..."

فۆمیکۆ سەرنجی قسەکانی دا، وەها دیار نەبوو بڵێت نەخێر، یاخود دەنگی نەخێر لە دەمییەوە دەربچێت؛ "تکایە بمنێرەوە ڕابردوو!"

هیرای بە سەرنجەوە پرسی؛ "دەتەوێت بگەڕێتەوە ڕابردوو، بەلام دەتەوێت چی ئەنجام بدەیت؟"

"بارودۆخەکەم ڕاست دەکردەوە".

هیرای سەری لەقاند و گوتی؛ "تێدەگەم..."

"تکایە!" دەنگی پڕ بە قاوەخانەکە دەنگی دەدایەوە.

بیرۆکەی هاوسەرگیری کردنی لەگەڵ گۆرۆ لەمێشکی دابوو، چونکە لە لایەک تەمەنی ببووە بیست و هەشت ساڵ، لەلایەکی تریش بەو دواییانەش دایک و باوکی زۆریان لەسەر دەگوت کەی بیر لە هاوسەرگیری دەکەیتەوە؟ ئایا هیچ پیاوێکی باش نەهاتۆتە ژیانتەوە؟ لە هەمووی ناخۆشتر ساڵی پار خوشکە بیست و پێنج ساڵانەکەی هاوسەرگیری کرد، هەفتەی پێشووش ئیمەیلی لە برا بیست و سێ ساڵانەکەیەوە پێگەیشت کە هاوسەرگیری لەگەڵ کچێکدا کردووە دوای ئەوەی دووگیان بووە، واتە تەنها فۆمیکۆ بە سەڵتی ماوەتەوە.

فۆمیکۆ سەرەتا هیچ بیری لەبابەتەکە نەکردبویەوە، بەڵام دوای ئەوەی خوشکە بچووکەکەی هاوسەرگیری کرد هەستی بەوە کرد پێویستە ئەمیش هاوسەرگیری لەگەڵ گۆرۆ بکات.

هیرای جگەرەیەکی لە گیرفانی پانتۆڵەکەی دەرهێناو ڕووی کردە کازوو و گوتی؛ "وا باشترە ڕوونکردنەوەیەکی بەرچاوی بۆ بفەیت ئەی وانییە؟"

کازوو گوتی؛ "منیش پێم وایە دەبێت وا بکەم." دواتر کازوو لەلای چێشتخانەکە هاتە دەرەوە، لەبەردەم فۆمیکۆ وەستا، بەچاوە میهرەبانەکانی لێی دەڕوانی، پاشان پێی گوت؛ "گوێ بگرە دەبێت زۆر بەباشی گوێم بۆ بگریت باشە؟"

فۆمیکۆ؛ "چی؟"

"دەتوانیت بگەڕێیتەوە بەڵی، بەڵام ..."

"بەڵام چی؟"

"کاتێک دەگەڕێیتەوە گرنگ نییە چەندێک بە سەختی هەوڵت داوە، ئێستا بە هیچ جۆرێک ناگۆڕێت."

ئێستا بەهیچ جۆرێک ناگۆڕێت. ئەو دێڕە ئەوە بوو کە فۆمیکۆ بە هیچ جۆرێک خۆی بۆ ئامادە نەکردبوو؛ "ئێ؟"

"تەنانەت ئەگەر بگەڕێیتەوە ڕابــردووش هـمـمـم... بە خۆشەویستەکەت کە چووە بۆ ئەمەریکا بڵێیت هەست بە چی دەکەیت..."

"تەنانەت ئەگەر هەستەکانی خۆشمی پێ بڵێم؟"

کازوو؛ "ئێستا بە هیچ جۆرێک ناگۆڕێت."

"چی؟" فۆمیکۆ بە سەرسامییەوە وای گوت، چونکە هیچ چاوەڕێی ئەو کاردانەوە و قسەیە نەبوو.

بەڵام کازوو لەبەرئەوەی ڕاهاتووە کەمترین قسەبکات و ئەو کاتانەش ڕاستییەکان بڵێت، بۆیە بەلایەوە گرنگ نەبوو فۆمیکۆ چۆن بیر دەکاتەوە، بەردەوامی دا بە قسەکانی و گوتی؛ "گەڕانەوەت بۆ ڕابردوو ناتوانێت وەها لە خۆشەویستەکەت بکات نەڕوات بۆ ئەمەریکا."

تەزوویەک تەواوی لەشی فۆمیکۆی گرتەوە، نوقم بووبوو لەناو قسەکانی کازوو دا، کازوو درێژەی پێدا و گوتی؛ "تەنانەت ئەگەر بگەڕێیتەوە ڕابردوو تەواوی هەستەکانی خۆتی بۆ دەرببڕیت ئەوا بە هیچ جۆرێک ئێستات ناگۆڕێت و ڕێ لە ئەو ناگرێت نەڕوات."

فۆمیکۆ بە سەرسوڕماوییەوە گوتی؛ "هەست ناکەیت بەم جۆرە زۆر لە ئامانجە سەرەکییەکە دووردەکەوینەوە؟"

هیرای؛ "با ڕاستەوخۆ هێرش نەکەینە سەر پەیامەکە."

جگەرەیەکی تری داگیرساند و هیچ سەرسام نەبوو بە قسەکانی فۆمیکۆ.

فۆمیکۆ؛ "بۆچی؟" چاوی بڕیبووە نێو چاوەکانی کازوو، چاوەڕێی وەڵامی دەکرد؛ "بۆچی وەڵامم بدەوە من لە تۆ دەپرسم؟"

کازوو؛ "چونکە ئەوە یاساییە."

ڕەنگە ئێمە لە فیلم یاخود ڕۆماندا گەشتی کاتمان بیستبێت. لە هەندێکیاندا دەڵێت مەچۆ ناوەڕاستی هیچ شتێکەوە کە ئێستات بگۆڕێت. بۆ نمونە بگەڕێیتەوە ڕابردوو تاکو ڕێگە لە هاوسەرگیری نێوان دایک و باوکت بگریت، ئەو کاتە تۆش لە ئێستادا دەسڕێیتەوە و بوونت نامێنێت.

ئەمە یەکێک بوو لەو یاسا نەگۆڕانەی کە فۆمیکۆ درکی پێکردبوو و بیستبووی دەربارەی گەشتی کات، ئەگەر ڕابردوو بگۆڕیت ئەوا بێگومان ئێستاشت دەگۆڕیت.

بۆ نمونە ئەو دەیویست بگەڕێتەوە دواوە و سەرلەنوێ دەست پێبکاتەوە، بەڵام ئەمە ڕووی نەدەدا، چونکە تەنها خەونێک بوو.

ئەوەی فۆمیکۆ لێی تێنەدەگەیشت ئەوە بوو بۆچی هیچ یاسایەکمان نییە بۆ ئەوەی ئەگەر ڕابردوو بگۆڕین ئێستا هەر

به نەگۆڕی دەمێنێتەوە. تاکە ڕوونکردنەوە کە کازوو کردی دەربارەی ئەم یاسایە ئەوە بوو کە پێی بڵێت ئەمە یاسایە. کازوو هەوڵی دەدا تەنها بە شێوازێکی هاوڕێیانە بابەتەکەی تێبگەیەنێت، نەوەک بە شێوازێک کە هۆکارەکەشی بۆ ڕوونبکاتەوە، ڕەنگە هێندە سەخت بووبێت کازوو نەیتوانیبێت ڕوونی بکاتەوە، یاخود هۆکارەکە ئەوەندە قورسە کە ڕەنگە فۆمیکۆ لێی تێنەگات.

دووبارە هیرای خۆی هەڵدایە ناوە گفتوگۆکە و گوتی؛ "چەند بە بەختیت" دووبارە قومێکی تری لە جگەرەکەی دەستی دا.

فۆمیکۆ هەستی دەکرد هەموو لەشی دەستی بە لەرزین کردووە، چونکە هیچ وەڵامێکی "بۆچی" دەست نەکەوت. لەوەش زیاتر لەسەر مێزەکەی بەردەستیدا ڕۆژنامەیەکی لێبوو کە نوسرابوو؛ ئەو ڕاستییە نەزانراوەی دەربارەی قاوەخانەی گەشتی کات بزانە.

قاوەخانەکە بە ناوی بەرز و نزم ناونرابوو، کە هەمووان دەیانزانی شتێکی مەحاڵی تێدا ئەنجام دەدرێت، ئەویش گەشتی کاتە، بەڵام ئەوەی کڕیارەکانی بێزار دەکرد و پەشیمانی دەکردنەوە لە ئەنجامدانی گەشتەکە یاساکان بوو، کە بەم جۆرە بوون، یاسای یەکەم: تەنها دەتوانیت بگەڕێیتەوە ئەو کەسانە ببینیت کە پێشتر سەردانی قاوەخانەکەیان کردبێت. یاسایەکی تر ئەوە بوو هەرچەندی ڕابردوو بگۆڕیت ئێستا بە هیچ جۆرێک ناگۆڕێت. پرسیاری هۆکاری ئەمە زۆر دەکرا، بەڵام وەڵامێکی دیاری نەبوو.

تەنانەت ئەو نوسەرەشی بابەتەکەی نووسیبوو کەسێکی دەست نەکەوتبوو گەڕابێتەوە ڕابردوو پاشان ئێستا، هەر بۆیە هەندێک کەس کارەکەیان بەبێ هوودە دادەنا، چونکە هیچ سوودی نەبوو لە گۆڕینی ئێستادا.

بابەتەکە باسی ئەفسانەی دەکرد، بەڵام کەس نەیدەزانی.

فۆمیکۆ دووبارە سەرنجی گەڕایەوە لای هیرای کە لەبەرانبەریدا دانیشتبوو، پێدەچوو یاسایەکی تری بۆ ڕوون بکاتەوە، ئەوەی وای لە فۆمیکۆ کردبوو سەری بسوڕمێت ئەوەبوو ئاخۆ بۆچی قاوەکە شەکری تێناکرێت.

"باش گوێ بگرە، تەنها یاساکان ئەمانە نین، یاسای تریشمان هەیە، دەبێت تەنها لەسەر ئەم کورسییە دابنیشیت باشە؟" هیرای ڕووی کردە کازوو گوتی؛ "چ شتێکی تر ماوە بیرمان چووبێت؟"

کازوو لەو کاتەی سەرقاڵی تێکردنی قاوەکە بوو گوتی؛ "کاتێکی دیاریکراوت هەیە ئاگاداربە".

فۆمیکۆ بە سەرسوڕماوییەوە گوتی؛ "کاتێکی دیاریکراو؟"

کازوو بە زەردەخەنەیەک وەڵامی دایەوە، هیرایش خۆی هەڵدایەوە ناو قسەکان و گوتی؛ "سەرەڕای ئەم یاسانەش هێشتا خەڵک دەیەوێت بگەڕێتەوە ڕابردوو. کاتێکی زۆر تێپەڕبووە کە کڕیارێکی وەکو تۆمان نەدیووە."

کازوو بە شێوازی ئاگادارکردنەوە؛ "هیرای ..."

"ژیان لە قاپێکی بەتاڵدا خزمەتت ناکات، ئیتر بۆچی دەست هەڵناگریت؟"

**تەق-تەق**

ئافرەتێکی شۆخ و شەنگ کە بلوسێکی بێجی و پانتۆڵێکی قاوەیی لە پێدا بوو، جانتایەکی قوماشی سپی لە دەست بوو، چاوەکانی دەدرەوشانەوە خۆی کرد بە قاوەخانەکەدا.

"سڵاو کازوو"

"سڵاو خوشکێ"

کازوو بە خوشک بانگی دەکرد، بەڵام لە ڕاستیدا خوشکی نەبوو، بەڵکو هاوسەری کی تۆکیتای ئامۆزای بوو.

"تەماشا بکە چەندە بە جوانی گەشەیان کردووە."

"بەڵێ، درەختە گێلاسەکە زۆر بە باشی گەشە دەکات." کازوو بە هەمان شێوە قسەی لەگەڵ دەکرد، بەڵام کەمێکیش جیاواز بوو وەک لەوەی لەگەڵ فۆمیکۆ قسەی دەکرد.

هیرای سڵاوی لێکرد؛ "ئێوارەت باش." بە پێکەنینەوە لەسەر کورسییەکە هەستایەوە کە بەرانبەر فۆمیکۆ دانیشتبوو گوتی؛

"لەکوێ بوویت؟"

"نەخۆشخانە"

"بۆچی؟ بابەتەکە ڕۆژانەیە؟"

"بەڵێ"

"ئەمڕۆ دەمووچاوت ڕەنگاوڕەنگ کردووە."

کی؛ "بەڵێ هەست بەباشی دەکەم."

**تەق-تەق**

ساتی دواتر کی ون بوو، چووە ژووری پشتی مێزی ژمێریارەکە.

دواتر پیاوێکی باڵا بەرز بە جلی شێف و کڵاوی شێفەوە هاتە دەرەوە لە ژوورەکە، ئەو پیاوە شێفەکە بوو خاوەنی قاوەخانەکەش، ناگاری تۆکیتا.

"سڵاو کازوو"

ناگاری ڕاستەوخۆ بەرەو ئەو پیاوە ڕۆیشت کە ڕۆژنامەکەی بەدەستەوە بوو، بە تەنها دانیشتبوو، کازووش کوپەکەی بەردەم هیرای هەڵگرت و بردیە سەر مێزی ژمێریارەکە. ناگاری بە هێمنییەوە چووە بەردەم پیاوەکەو گوتی؛ "فوساجی".

پیاوەکە سەرەتا سەری هەڵنەبڕی، پێدەچوو بە باشی گوێی لەناوی خۆی نەبووبێت، بەڵام دواتر سەری بەرزکردەوە.

ناگاری بەڕەوشتەوە سڵاوی لێکرد؛ "سڵاو".

فوساجی وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە، بەڵام دووبارە تەماشای ڕۆژنامەکەی کردەوە بەبێ ئەوەی قسەی تر بکات. ناگاری ڕووی کردە چێشتخانەکە و بانگی کازووی کرد؛ "کازوو"

کازوو سەری هێنایە دەرەوە؛ "بەڵێ، چی بووە؟"

"تکایە دەتوانیت پەیوەندی بە کۆهتاکیەوە بکەیت؟"

بۆ ساتێک کازوو سەری سوڕما بوو، دواتر ناگاری گوتی؛ "بەڵێ، چونکە بەدوایدا دەگەڕێن."

کازوو درکی پێکرد؛ "ئۆو بەڵێ".

دوای کەمێک چووە چێشتخانەکە، دووبارە بۆ ئەوەی پەیوەندییەکەی بکات. ناگاری چووەوە ئەودیو مێزی ژمێریارەکە، لەناویدا پەرداخێکی شووشەی دەرهێنا، دواتر لەناو بەفرگرەکەدا بەفر و پرتەقاڵی دەرهێنا تاکو شەربەتی پێ دروست بکات. لەو کاتەدا کە ناگاری سەرقاڵی شتنی پەرداخەکە بوو تاکو شەربەتەکەی لەناو بکات، گوێی لە دەنگی کەسێک بوو بە نینۆکەکانی دەیکێشا بە مێزەکەدا، لەو کاتەدا ناگاری ئاوڕی دایەوە هیرای دانیشتبوو لەسەر کورسی بەردەم مێزی ژمێریارەکە، پێدەچوو دەنگەکە ئەو بێت، هیرای کەمێک لێی هاتە پێشەوە، پاشان گوتی؛ "چۆن بوو؟"

هیرای بە دەنگی نزمەوە گوتی؛ "ئەنجامی تاقیکردنەوەکە چۆن بوو؟"

ناگاری هیچ وەڵامی نەبوو، تەنها سەری داخست، هیرای گوتی؛ "ئایا خراپ بوو؟"

کی بە دڵێکی لاوازەوە لە دایک بووبوو، زۆربەی ژیانی لە چوونە نەخۆشخانە بەسەربردبوو، هەوڵی دابوو کە ژیانی ئاسایی ببێتەوە، هەرچەندە هیرای هاوڕێیان بوو، بەڵام ناگاری نەیدەویست زیاتر لەسەر بابەتەکە قسە بکات، بۆیە پرسی؛ "شتەکان لای تۆ چۆنن هیرای؟"

هیرای دڵنیا نەبوو مەبەستی چییە گوتی؛ "مەبەستت چییە؟"

"خوشکەکەت هاتبوو تاکو سەردانت بکات وایە؟"

دوای ئەوەی هیرای چاوێکی گێڕا بە قاوەخانەکەدا گوتی؛

"ئۆو بەڵێ وابزانم."

"دایک و باوکت چوون بۆ گەشت وایە؟"

"بەڵێ، وایە."

ناگاری زۆر بە وردی بابەتەکانی نەدەزانی، بەڵام ئەوەی دەزانی کە لە دوای دایک و باوکی دەبوو هیرای و خوشکەکەی مەیخانەکە بەڕێوە ببەن.

"ڕەنگە بۆ خوشکەکەت قورس بێت ئەگەر بەتەنها ئەو کارە بکات."

"نا، خوشکەکەم بەباشی دەتوانێت تەواوی کارەکان ئەنجام بدات بێ هیچ هەڵەیەک."

"بەڵام هێشتا..."

هیرای بە بێ ئومێدییەوە گوتی؛ "زۆردرەنگ بووە ناتوانم بگەڕێمەوە."

"بۆچی نا؟"

"تەنانەت ئەگەر بمەوێت بڕۆمەوە ناتوانم یارمەتیدەر بم."

"بەڵام..."

"بەهەر حاڵ سوپاس بۆ قاوەکە دەبێت بڕۆم."

دواتر پارەی قاوەکەی لەسەر مێزی ژمێریارەکە بەجێهێشت و ڕۆیشت، بەپەلە لە دەرگاکە چووە دەرەوە وەک ئەوەی لە گفتوگۆکە ڕابکات.

**تەق-تەق**

دوای ئەوەی ناگاری پارەکەی هەڵگرتەوە کە هیرای بەجێی هێشتبوو تەماشای فۆمیکۆی کرد، هیچ پرسیارێکی نەکرد دەربارەی ئاخۆ ئەو خاتوونە کێ بوو، بۆ هێندە بەپەلە ڕۆیشت.

کازوو؛ "سڵاو برا."

هەرچەندە کازوو و ناگاری خوشک و برا نەبوون، بەڵام کازوو بە برا بانگی دەکرد؛ "بەڵێ؟"

"خوشکێ پەیوەندیت پێوە دەکات."

"باشە وا هاتم." بەپەلە ناگاری پارەکەی خستە ناو دەستی کازووەوە.

کازوو؛ "کۆهتاکی گوتی ڕاستەوخۆ بۆ ئێرە دێت."

ناگاری دوای بیستنی هەواڵەکە گوتی؛ "ئاگاداری قاوەخانەکە ببە باشە؟"

"باشە."

دوای ئەوەی هیرای و ناگاریش ڕۆیشتن تەنها فۆمیکۆ و فوساجی و ئەو خاتوونەی لێمابۆوە کە کتێبی دەخوێندەوە، کازوو پارەکەی خستەوە جێی خۆی، پاشان کوپەکەی هەڵگرت تاکو بیشوات، لەو کاتەدا تاکە دەنگێک گوێ دەبیست دەنگی چرکە چرکی کاتژمێرە کۆنەکانی دیوارەکە بوو.

"قاوەیەک تکایە."

فوساجی کوپەکەی بە دەستەوە بوو لەودیو مێزی ژمێریارەکەوە وەستابوو. کازوو؛ "ئۆ، بەڵێ بە دڵنیاییەوە."

کازوو بەپەلە گەڕایەوە چێشتخانەکە، پاشان کوپێکی پاکی بەدەستەوە بوو.

## تەق-تەق

فۆمیکۆ خۆی دابوو بەسەر مێزەکەدا؛ "تەنانەت بەو جۆرەش هەر باشە."

لەو کاتەدا کازوو سەرقاڵی تێکردنی قاوە بوو بۆ فوساجی.

فۆمیکۆ؛ "تەنانەت ئەگەر نەشتوانم لەگەڵیدا بژیم ئاساییە."

کازوو؛ "ڕاستە".

فۆمیکۆ هەستایە سەرپێ و لە کازوو نزیک بویەوە گوتی؛ "کەواتە بمگەڕێنەوە بۆ هەفتەیەک پێش ئێستا."

"همم...بەڵام".

کازوو بێ ئەوەی هیچ شتێکی تر بڵێت گەڕایەوە ئەودیو مێزی ژمێریارەکە، چونکە هەستی بەوە دەکرد کە فۆمیکۆ چەندە بە بابەتەکە نارەحەت بووە.

کازوو گوتی؛ "یاسایەکی ترمان هەیە کە زۆر گرنگە."

فۆمیکۆ؛ "چی؟ یاسای تر ماوە؟"

"ئێستا ناگۆڕێت، کە گەڕایتەوە دەبێت لەسەر کورسییەکە نەجوڵێیت، هەروەها کاتێکی دیاری کراوت هەیە." فۆمیکۆ بە توڕەیەوە دانە بە دانەی یاساکانی دەژمارد.

"ئەم دانەیان بێگومان دەبێت سەربەکێشەترین یاسا بێت."

هەستی بە شڵەژان و بێزاریکرد، چونکە بێگوومان ئەو یاسایەی ماوەتەوە دەبێت لەوانی تر سەختتر بێت، بەڵام ناچاربوو.

"باشە من ڕازیم ئەگەر بەوجۆرە بێت کێشە نییە باسی بکە."

کازوو بەپەلە چووەوە چێشتخانەکە تاکو کوپ و کترییە زیوییەکە بهێنێت کە کارەکەی پێ ئەنجام دەدات، فۆمیکۆش هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی بە ئومێدی ئەوەی بگەڕێتەوە و کارێک بکات گۆرۆ ڕابگرێت لە چوونی بۆ ئەمەریکا. لە مێشکی خۆیدا قسەکانی لێکدەدایەوە کە چی پێ بڵێت تاکو ڕێگری لێبکات لە چوونی بۆ ئەمەریکا، دەیگوت ڕەنگە ئەگەر بڵێم مەڕۆ ئەو کاتە پەشیمان ببێتەوە و نەڕوات، واتە هۆکاری سەرەکی چوونی بۆ ڕابردووی بەرچاو بوو کە دەیویست ئێستا بگۆڕێت.

بەڵام ئەوەیان شتێکی مەحاڵ بوو، چونکە فۆمیکۆ هەرچەندە بگەڕایەتەوە ڕابردوو ئەوا بە هیچ جۆرێک نەیدەتوانی ڕێگە بگرێت لە چوونەکەی گۆرۆ، بەڵام لە هەمان کاتیشدا تەنها شانسی ئەوەی هەبوو کە بیبینێت.

فۆمیکۆ بیری دەکردەوە ئاخۆ ئەو کارەی کردوویەتی ڕاستە یاخود هەڵەیە، بەڵام ئەو شتەی نەدەزانی تەنها ئەو دێڕە نەبێت کە لەمێشکی دا دەخولایەوە ئەگەر باش نەبێت ئەی بۆ خراپ بێت؟ لەو کاتەدا فۆمیکۆ سەرقاڵی هەناسە هەڵکێشان بوو، کازوو هاتەوە ئامێری قاوە ئامادەکردن و کوپەکەشی لە دەست بوو.

"تەنها ئەو کاتە دەتوانین کارەکە ئەنجام بدەین کاتێک کورسییەکە بەتاڵ دەبێت."

فۆمیکۆ بە سەرسوڕماوییەوە؛ "کام کورسییە؟"

فۆمیکۆ چاوی بە قاوەخانەکەدا گێڕا، بە هەموو کورسییەکاندا کە لەو کاتەدا بەتاڵ بوو، چاوی چووە سەر ئەو کورسییەی کە ژنە کراس سپییەکە لەسەری دانیشتووە، کازوو: "ئەو کورسییە."

فۆمیکۆ بە چپەوە لێی هاتە پێش و گوتی: "ئەوەی کە ژنەکەی لەسەر دانیشتووە؟"

کازوو: "بەڵێ".

کازوو قسەکەی تەواو نەکرد فۆمیکۆ بەرەو لای ژنەکە ڕۆیشت.

فۆمیکۆ کە نزیک بووەوە سەری سوڕما، ژنەکە بەجۆرێک بوو وەک ئەوەی بڵێیت ژنەکە هەستی بەوە نەکردووە کەسێک لە بەردەمی وەستاوە، جیا لەوەش ژنەکە کراسەکەی بەهارە بوو، پێدەچوو هیچ چاکەتێکیشی پێنەبێ، کە هیچ لەگەڵ جلی ئەم وەرزەدا نەدەگونجا، فۆمیکۆ هەستی بەوە کردبوو کە شتێک لێرەدا نهێنییە، بەڵام بەلایەوە گرنگ نەبوو پرسیار بکات، بەڵکو دەیویست کارەکە کۆتایی پێبێت و ڕزگاری ببێت.

فۆمیکۆ بە شێوازێکی فەرمییانە گوتی: "ببورە، دەتوانیت لەو جێیە هەستیت؟"

بەڵام ژنەکە هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو، فۆمیکۆ کەمێک هەستی بە شەرمەزاری کرد لەوەی ژنەکە هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، بەڵام هەوڵیدا جارێکی تر دووبارەی بکاتەوە، هەر بۆیە دیسان پرسیاری کرد و گوتی: "سڵاو ...گوێت لێمە؟"

کازوو؛ "تەنها کاتی خۆت بەفیڕۆ دەدەیت."

ئەو دەنگە چاوەڕوان نەکراوەی لە پشتەوەی فۆمیکۆ هات دەنگی کازوو بوو لەو کاتەدا فۆمیکۆ ئاوڕی دایەوە پاشان دیسان کەوتە ناو بیرکردنەوە. من تەنها دەمەوێت لەو جێیە دابنیشم. بۆچی کاتی خۆم بەفیڕۆ دەدەم؟ ئایا لەوەدا کاتی خۆمم بەفیڕۆدا کە بە بەڕێزییەوە داوام لێکرد؟ بوەستە، ئایا ئەمەش یاسایەکی ترە؟ ئایا دەبێت ئەم یاسایە چارەسەر بکەم پێش ئەوەی دیکە؟ بەڵام ئەگەر وا بوایە لانی کەم شتێکی تری دەگوت کە جیاوازبێت لەوەی تەنها کاتی خۆت بەفیڕۆ دەدەیت...

سەرەڕای ئەم هەموو بیرکردنەوانە هەموو پرسیارێکی فۆمیکۆ ئەوە بوو؛ "بۆچی؟"

کازوو بە نەرم و نیانییەوە گوتی؛ "چونکە ئەو ئافرەتە.... تارماییە". قسەکەی شۆکهێنەر و مایەی سەرسوڕمان بوو، وەکو ئەوە بوو ڕاستییەکی ترسناک باس بکات.

جارێکی تر مێشکی فۆمیکۆ کەوتەوە ناو جەنجاڵی بیرکردنەوە. چی؟ تارمایی؟ هەر بەڕاستی ئەو ژنە تارماییە؟ فۆمیکۆ بە دەم سەرقاڵی بیرکردنەوەکانی و سەرسوڕماویدا گوتی؛ "تارمایی؟"

"بەڵێ".

"تۆ گاڵتە بە من دەکەیت؟"

"نەخێر، چونکە هەر بەڕاستی ئەو تارماییە."

فۆمیکۆ کێشەی لەوەدا نەبوو کە تارماییەکی دیووە،

کێشەشی لەوەدا نەبوو کە ئەو بیرۆکەیە ڕاستە کە دەڵێن تارماییەکان بەڕاستی بوونیان هەیە، ئەوەی مێشکی فۆمیکۆی سەرقاڵ کردبوو ئەوە بوو ئەو ژنە شۆخ و شەنگەی لەوەی دانیشتووە تارمایی بێت کە زۆر لە ڕاستی دەچێت وەک لە خەیاڵێک.

"بەڵام من دەتوانم ...".

کازوو قسەکەی پێبڕی، چونکە دەیزانی دەیەوێت چی بڵێت؛ "دەتوانیت دەستی لێبدەیت."

فۆمیکۆ دەستی خستە سەر شانی ژنەکە، زۆر بە ئاسانی دەیتوانی هەست بە گەرمی جەستەی ژنەکە بکات، هێشتا باوەڕی بەوە نەهێنابوو ئەو ژنە تارمایی بێت.

دووبارە دەستی خستەوە سەر شانی و پاشان ئاوڕی لە کازوو دایەوە، ئەم ژنە دەتوانم بە ئاسانی دەستی لێبدەم، گوتنی ئەوەی کە تارماییە شتێکی شێتانەیە!

ڕووخساری کازوو بەبێ هیچ دەربڕینی هەستێک دووبارە گوتی؛ "ئەو تارماییە."

"بەڕاستی تارماییە؟"

فۆمیکۆ بە سەرسوڕماوییەوە دووبارە پرسیاری کردەوە و پەنجەی ئاماژەی بۆ ژنەکە ڕاکێشا. کازوو؛ "بەڵێ."

ئەگەر فۆمیکۆ بیبینیایە بەڵام نەیتوانییایە دەستی لێبدات، ئەو کاتە ڕەنگە باوەڕی بەوە بکردایە کە تارمایی نییە. جیا لەوەش ژنەکە قاچی هەبوو، ئینجا پەرتوکێکی بە دەستەوە بوو

که ناوەکەی نەبیستراو بوو بۆ ئێستا، بەڵام پەرتوکێکی ئاسایی بوو کە وەکو هەموو مرۆڤێکی ئاسایی دەتتوانی دەستت بکەوێت و بیکڕیت.

ئەمەش وای کرد فۆمیکۆ بگاتە ئەو باوەڕەی کە ئەم قاوەخانەیە بەڕاستی ناتگەڕێنێتەوە بۆ ڕابردوو، هەموو ئەوەی دەگوترێت دەربارەی قاوەخانەکە تەنها پڕوپاگەندەیە و بەس بۆ ڕاکێشانی کڕیارە، ئەگەر ڕاست بێت بۆچی ئەم هەموو یاسا بێمانایانە دانراوە، بۆچی تاکو ئێستا کەس نەبووە لەو کاتە گەڕابێتەوە و باسی ڕابردوو بکات.

ئەگەر ئەوە درۆبێت، کەواتە با درۆ بێت، بەڵام من بەو درۆیە ناخەڵەتێم.

فۆمیکۆ دووبارە بە نەرم و نیانی بە ژنەکەی گوت: "تکایە دەتوانیت لە جێگاکە هەستیت، زۆر ناخایەنێت".

بەڵام هەر وەکو ئەوە بوو قسەکانی نەگەیشتبێت بە گوێی ژنەکە، تەنانەت بەردەوام بوو لە خوێندەوە، بێ ئەوەی وەڵامی بداتەوە.

فۆمیکۆ دەستی ئافرەتەکەی گرت و بەرزی کردەوە، لەو کاتەدا کازوو هاواری کرد بەسەریدا: "بوەستە پێویست ناکات بەو جۆرە ڕەفتار بکەیت."

فۆمیکۆ دووبارە هەوڵیدا ئافرەتەکە بەرز بکاتەوە لەسەر کورسییەکە، ئەمجارە ژنەکە هەستایەوە، بەڵام فۆمیکۆ هەستی بە لەش قورسی کرد و وەکو ئەوەی لەناو ئاودا گیریخواردبێت

ساتی دواتری هاتەوە هۆش، پرسیاری کرد کەوا چی ڕوویداوە، کازوو گوتی؛ "ئەو جادووی لەتۆ کرد."

فۆمیکۆ؛ "چی؟ چی ڕوودەدات؟"

"ئەوە جادووە، تۆ کارێکی هەڵەت کرد، ئەویش بەو جۆرە جادووی لەتۆ کرد ."

کازوو چووە چێشتخانەکە بەبێ ئەوەی گوێ بە فۆمیکۆ بدات لەسەر زەوییەکە کەوتبوو.

دواتر فۆمیکۆ هێندەی هەست پێکرد تەپەی پێی کەسێک دێت لێی نزیک دەبێتەوە، ئاوی پرژاند بە دەمووچاویدا.

"بێگومان تۆ گاڵتەم لەگەڵ دەکەیت، پێم بڵێ چی بووە؟"

هیچ وەڵامێک لە فۆمیکۆ وە نەبوو، فۆمیکۆ سەری سورما بوو ئەو ئافرەتە هیچ بەوە نەدەچوو کە کەمێک پێش ئێستا پەرتووکی دەخوێندەوە، فۆمیکۆ بەپەلە هاواری کرد؛ "یارمەتی، یارمەتی!"

کازوو بەپەلە لە چێشتخانەکە هاتە دەرەوە، کوپێک قاوەی بە دەستەوە بوو، فۆمیکۆ سەرسام بوو ئاخۆ کوپە قاوەکەی بۆ کێیە، ژنەکە بە نەرمییەوە پێیگوت؛ "کوپێک قاوە تکایە".

فۆمیکۆ هێندەی تر شۆکەکەی زیادی کرد، ئەو ژنە جیا لەوەی کە تارماییە، ئێستاش داوای قاوە دەکات و قسە دەکات.

ئێستا فۆمیکۆ تێگەیشت کە دەبێت بە ڕاستی یاساکان ڕاست بن، هەڵەکە لە فۆمیکۆدا بوو، دەبێت یاساکان جێبەجێ بکات، ئەو لاساریی کرد و قۆڵی ژنەکەی ڕاکێشا، زۆری لێکرد تاکو

لە جێیەکەی هەستێتە سەرپێ، بەڵام دواتر جادووی لێکرد و کەوتە سەر زەوییەکە، کەواتە نابێت فۆمیکۆ چیتر لاساری بکات.

هەموو ئەوەی فۆمیکۆ توانی لەو چرکەیەدا بیڵێت؛ "بێگومان تۆ گاڵتەم لەگەڵ دەکەیت!"

"بەڵێ، تکایە"، ئەو دەنگە دەنگی ژنەکە بوو، فۆمیکۆ هەستی بە لەرز کرد، ئەوە چی دەبیستێت؛ "ئەها!"

وردە وردە جادووەکە فۆمیکۆی بەردەدا، پاشان فۆمیکۆ بە داماوی تەماشای کازووی دەکرد، بەچاو داوای یارمەتی لێدەکرد، بەڵام کازوو هیچ شتێکی نەگوت، دووبارە گەڕایەوە چێشتخانەکە، فۆمیکۆ تەنها لە ژنەکەی دەڕوانی، هەر بەڕاستی ئەو ژنەی کە کراسە سپییەکەی لەبەردایە و تارمایییە بوونی هەیە.

فۆمیکۆ لە هەموو ئەو شتانە تێنەدەگەیشت کە ڕوویان دەدا و تەنها سەریسوڕما بوو، هەستایەوە سەرپێ. هەستی بە سەرسوڕان دەکرد، وەکو ئەوەی لەناو باڵۆنێکی پڕ لە ئاودا بێت خۆی گەیاندا لای مێزی ژمێریارەکە، لەسەر کورسییەکە دانیشت، ڕاستەوخۆ پرسیارەکەی ئاڕاستەی کازوو کرد؛ "هەر بەڕاستی ئەو تارمایییە؟"

هەموو وەڵامی کازوو تەنها ئەوە بوو؛ "بەڵێ."

کەواتە ئەمە شتێکی مەحاڵە کە ڕوودەدات... کەواتە ئەگەر تارمایییەکە ڕاست بێت... جادووەکەش ڕاستبێت، کەواتە... هەموو ئەو شتانەی کە دەیڵێن دەربارەی گەڕانەوە بۆ ڕابردوو ڕاستە!

هەموو بیرکردنەوەکان بە فۆمیکۆیان ڕادەگەیاند کە کەواتە تۆ دەتوانیت بگەڕێیتەوە ڕابردوو، بەڵام تەنها کێشەیەک هەیە ئەویش ئەوەیە یاساکە دەڵێت کە دەبێت لەسەر ئەو کورسییە دابنیشیت تا کۆتایی گەڕانەوەکە، بەڵام ئەوە کێشەکەیە ئەو ژنە لەسەر ئەو کورسییە دانیشتووە و ژنەکە تارماییە، لەوەش زیاتر ژنەکە لەسەر کورسییەکە هەڵناستێت، تەنانەت هەوڵیدا بەزۆر ژنەکە هەستێنێت، بەڵام ژنەکە جادووی لێکرد، کەواتە دەبێت چی بکەم تاکو لەسەر ئەو کورسییە دابنیشم؟

کازوو گوتی؛ "تەنها دەبێت چاوەڕێ بکەیت" وەکو بڵێی بیرکردنەوەکەی فۆمیکۆی بیستبێت.

"مەبەستت چییە؟"

"هەموو ڕۆژێک لە خولەکێکی دیاری کراودا دەچێت بۆ توالێت".

"تارمایی پێویستی بەوە هەیە بچێتە توالێت؟"

"لەو کاتەی دەڕوات دەتوانیت بچیتە جێگەکەی".

فۆمیکۆ هیچی پێنەگوترا، دووبارە هەستی کردەوە کە کازوو پێی ڕادەبویرێت، یاخود گاڵتەی لەگەڵ دەکات، چونکە بە هیچ جۆرێک نەدەچووە ئەقڵەوە تارماییەک بچێتە توالێت، ئەمە گاڵتەجاڕییە یاخود کازوو بۆیە وا دەڵێت تاکو بابەتەکە لەکۆڵ خۆی بکاتەوە، بەڵام فۆمیکۆ بە ناچارییەوە گوتی؛ "کەواتە باشە چاوەڕێ دەکەم".

"باشه، بەڵام دەبێت ئەوەش بزانیت ئەو جیاوازی ناکات لە نێوان شەو و ڕۆژدا".

"باشە من چاوەڕێ دەبم."

"چ کاتێک ئێرە دادەخەیت؟"

"بە شێوەیەکی گشتی دوای کاتژمێر هەشتی ئێوارە، بەڵام ئەگەر دەتەوێت بمێنیتەوە دەتوانیت تاکو ئەو کاتە بمێنیتەوە."

"سوپاس!"

فۆمیکۆ لە نێو سێ مێزەکەدا لەسەر ئەوەی ناوەڕاست دانیشت، ڕاستەوخۆ بەرانبەر ژنەکە دانیشت و سەرنجی دەموچاو و ڕووخساری ژنەکەی دەدا.

"من ئەو جێگایە بە دەست دەهێنم."

کازووش لە دوورەوە تەنها تەماشای دەکردن، ژنەکەش پەرتوکەکەی دەخوێندەوە بەبێ ئەوەی گوێی لە قسەکەی بێت.

**تەق-تەق**

"سڵاو ئێوارە باش!" کازوو بە کۆهتاکی گووت.

کۆهتاکی کە دەهاتە ژوورەوە لە دەرگاکە چاکەتێکی شینی کردبووە سەر جلە پەرستارییەکانی، جانتایەکی گەورەی لەشان بوو، هەناسەبڕکێی بوو، پێدەچوو کە لە ڕێگاوە هاتبێت، ماندوو بووبێت.

"سوپاس بۆ پەیوەندی کردن."

کازوو بە زەردەخەنەیەک وەڵامی دایەوە بێ ئەوەی هیچ

شتێک بڵێت، دواتر چووەوە چێشتخانەکە، کۆهتاکی بەرەو ئەو مێزە ڕۆیشت کە فوساجی لەسەر دانیشتووە، بەڵام وا پێدەچوو کە تەنانەت تێبینی ئەوەی نەکردبێت خانمێک بەوێدا تێپەڕی.

کۆهتاکی بە تۆنێکی نەرموونیانەوە وەکو ئەوەی لەگەڵ منداڵ قسە بکات گوتی؛ "فوساجی".

سەرەتا فوساجی هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو، بەڵام دواتر سەری هەڵبڕی و وەڵامی دایەوە؛ "کۆهتاکی".

کۆهتاکی وەڵامی دایەوە؛ "بەڵێ، ئەوە منم".

"چی دەکەیت لێرە؟"

"کاتی بەتاڵم هەبوو پێم باش بوو بە خواردنەوەی کوپێک قاوە بەسەری ببەم."

فوساجی؛ "هممم...باشە".

فوساجی گەڕایەوە بۆ خوێندەوەی گۆڤارەکەی، وەکو کاری هەمیشەیی کۆهتاکی بەرانبەری دانیشت و لێی دەڕوانی، بەڵام فوساجی لەجیاتی ئەوەی تەماشای بکات، تەنها لاپەڕەی دواتری گۆڤارەکەی هەڵدەدایەوە.

کۆهتاکی؛ "بیستوومە زوو زوو دێیتە ئێرە بەم دواییانە."

فوساجی بە سادەیی وەڵامی دایەوە؛ "بەڵێ."

"کەواتە ئەم جێیەت لا پەسەندە؟"

"ئۆو نا بەو جۆرە نییە."

پێدەچوو فوساجی پێشتر بیری لە وەڵامی ئەو پرسیارە نەکردبوەوە. "



بە چپەوە گوتی؛ "من چاوەڕێ دەکەم."

"چاوەڕێی چیت؟"

بە ئاماژەی چاو ئاماژەی بۆ ژنە کراس سپییەکە کرد و گوتی؛ "تاکو ئەو کورسییە چۆڵ بێت و لەوێدا دابنیشم".

وەک بڵێی فۆمیکۆ گوێی بۆ قسەکان شل کردبێ لە پڕ دەنگی بەرزکردەوە؛ "چیی؟"

درکی بەوە کرد ئەو هەموو ساتە فوساجی بۆیە چاوەڕێیە تاکو لە جێی ژنە کراس سپییەکەدا دابنیشێت.

فوساجی تەنها هەستی بە شەرمەزاری دەکرد و هیچی تر، کۆهتاکی؛ "هەر ئەوەندە؟"

"بەڵێ". پاشان قومێکی لە قاوەکەی دا.

فۆمیکۆ دەلەرزی، تکایە وام لێ مەکە کاردانەوەم هەبێت.

فۆمیکۆ هەستی بە دڵتەنگی و بێ ئومێدی دەکرد، چونکە نەدەکرا زۆر لە فوساجی بکات تاکو لە بڕیارەکەی پاشگەزببێتەوە، بەبیری خۆی هێنایەوە سەرەتا کە هات بۆ قاوەخانەکە پێش فوساجی، پێش ئەو دانیشتبوو لەو جێیەدا، ژنە کراس سپییەکەش ڕۆژی تەنها یەک جار دەچێتە توالێت، ئەمەش مانای وایە سەرەکە بەو جۆرەیە هەر کەسێک بیەوێت بگەڕێتەوە ڕابردوو دەبێت ڕۆژێکی تەواو بوەستێت تاکو نۆرەی دێت، ناشکرێت نۆرەبڕی ئەنجام بدرێت، هەر بۆیە فۆمیکۆ زیاتر گوێی شل کرد بۆ گفتوگۆکە تاکو دڵنیابێتەوە بەڕاستی فوساجی مەبەستی ئەوەیە بگەڕێتەوە ڕابردوو.

کۆهتاکی؛ "ئەمڕۆ لەو جێیە دادەنیشیت؟"

فوساجی؛ "ئەمڕۆ نا".

"ئۆو تۆ لەوێ دانانیشیت؟"

"بەڵێ... نەخێر".

گفتوگۆکەیان یەکلایی کەرەوە نەبوو، هێندەی تر ترسی فۆمیکۆیان زیادکرد.

"فوساجی، بۆ دەتەوێت بگەڕێیتەوە ڕابردوو؟"

پرسیارە بەجێکە لێرەبوو، چونکە ئەو هەموو ماوەیە فۆمیکۆ چاوەڕێی ئەو دەرفەتەی کردبوو، بەڵام بێ ئومێدی زیاتر بە ڕووخسارییەوە دەبینرا، گفتوگۆکە زیاتری خایاند.

کۆهتاکی؛ "دەتەوێت شتێک چاک بکەیتەوە؟"

فوساجی؛ "ئۆو بەڵێ". بۆ ساتێک کەوتە بیرکردنەوە، پاشان گوتی؛ "نهێنی منە".

"نهێنی تۆ؟"

"بەڵێ".

کۆهتاکی بە زەردەخەنەوە تەماشای ئافرەتەکەی کرد و لەوە تێگەیشت کە بەشێکی نهێنییەکەی زانییووە، ئەگەرنا پێی نەدەگووت، پاشان گوتی؛ "وا پێناچێت ئەمڕۆ بچێت بۆ توالێتەکە، وایە؟"

فۆمیکۆ هەرگیز بیری لەوە نەکردبوەوە، بۆیە دوای بیستنی ئەو قسەیە بەخێرایی سەری هەڵبڕی و کەوتە بیرکردنەوەی باشە، ئەمەش شتێکە ڕێی تێدەچێت، ئەگەر ئەو ژنە هەرگیز

نەچێتە توالێت چی دەبێت؟ هەرچەندە کازوو گوتی کە ڕۆژی یەکجار دەچێت، ئەی چی دەبێت ئەگەر پێش وەختە ڕۆیشتبێت.

فۆمیکۆ نزای دەکرد ئەوە ڕووی نەدابێت، بۆیە گوێی زیاتر شل کرد لە گفتوگۆکە تاکو بزانێت فوساجی چی دەڵێت.

"پێم وابێت تۆ ڕاست دەکەیت، ڕەنگە ئەوەش ببێت."

فۆمیکۆ دوای بیستنی ئەو قسەیە حەپەسا، چۆن شتی وا دەبێت، باشە کۆهتاکی چی دەزانێت دەربارەی ئەو ژنە، فۆمیکۆ درکی بەوە نەکردبوو، هێشتا کە نەدەبوو قسەکانیان پێ ببڕێت، چونکە ئەوەی دەزانی گرنگترین شت ئەوەیە کە لێکۆڵینەوە بکەیت لە بارودۆخەکە لە دوورەوە، وەک لەوەی تێکەڵ ببیت، بەڵام پێدەچوو کە کۆهتاکی پێی ناخۆش بووبێت، فۆمیکۆ بەو جۆرە تێکەڵ بوو، لێرەدا شتێک دەگوزەرا کە پێدەچوو خەڵکی ناو قاوەخانەکە دڵخۆش نەبن بەو کەسانەی دەرەوە کە سەردانی قاوەخانەکە دەکەن.

کۆهتاکی بە هێمنیەوە بە فوساجی گوت؛ "پێت چۆنە بڕۆین؟"

شانسە گەورەکەی گەڕایەوە بە ڕۆیشتنی فوساجی، بەڵام لێرەدا شتێکی تر دەهاتە پێشەوە کە ئایا ژنەکە دەچێتە توالێتەکە یاخود نا؟

کاتێک کۆهتاکی ئەو داوایەی لە فوساجی کرد، فوساجی هیچ ڕەتکردنەوەیەکی بۆ قسەکەی نەبوو، لەکاتێکدا گوتی ڕەنگە وا بێت، واتە نەک بە دڵنیایی، بەڵام هێشتا فوساجی بە ئاسانی قایل بوو کە بڕۆن، فۆمیکۆ بڕیاریدا بمێنێتەوە، چونکە هیوای

هەبوو بە بابەتەکە، دەیویست بە چاوی خۆی شتەکان ببینێت، جیا لەوەی هێندە بە سەرنجەوە گوێی بۆ قسەکان گرتبوو هەموو لەشی بوو بوو بە گوێ.

فوساجی بە سەرنجەوە تەماشای ژنەکەی کرد بۆ ساتێک، دواتر گوتی؛ "باشە."

هەرچەندە وەڵامەکەی فوساجی زۆر سادە بوو، بەڵام دڵی فۆمیکۆ کەوتە پەلە پەل، بەجۆرێک لێدانی زیاد بوو، فۆمیکۆ هەستی پێدەکرد.

کۆهتاکی تەماشەی کوپەکەی فوساجی کرد، نیوەی خواردبوەوە، گوتی؛ "کەواتە ئەو کاتە دەڕۆین کە قاوەکەت تەواو دەکەیت."

فوساجی بە تەواوی خۆی بۆ ڕۆیشتن ئامادە کردبوو؛ "نا هەرچۆنێک بێت سارد بوەتەوە با بڕۆین". جانتاو گۆڤار و پێنوس و تێنوسەکەی هەڵگرت و چاکەتەکەی پۆشی و بەرەو لای کازوو ڕۆیشت، کازووش پسوڵەکەی پێدا.

"چەندێک قەرزار دەبم؟"

فوساجی ناو کراس و جانتاکەشی گەڕا، بەڵام هیچی نەدۆزیەوە، پاشان گوتی؛ "پێم وابێت جزدانەکەم..." دوای ئەوەی گەڕایەوە شوێنەکەی بەدوای جزدانەکەی گەڕایە، بیری کردەوە کە ڕەنگە بەبێ جزدان هاتبێت بۆ قاوەخانەکە، هێندەی نەمابوو بگری، بەڵام لەو کاتەدا کۆهتاکی هات و جزدانەکەی پێدا و گوتی؛ "لێرەیە".

جزدانێكی چەرمی پیاوانە بوو، لە ناوەڕاستدا چەمابووەوە، بۆ ساتێک وەستا، سەرنجی دا، دواتر جزدانەکەی لێ وەرگرت بەبێ ئەوەی هیچ قسەیەک بکات، پاشان بە کازووی گوت؛ "چەندی کرد؟"

کۆهتاکی هیچی نەگوت وەکو پیشەی هەمیشەیی، لە دوای فوساجییەوە وەستابوو، دواتر کازوو گوتی؛ "سێ سەد و هەشتا یەن".

فوساجی یەک پارەی ئاسنی دەرهێنا و گوتی؛ "باشە پێنج سەد یەن هەڵبگرە..."

کازوو پارەکەی هەڵگرت و کردییە ناو ئامێری پارە هەڵگرتنەکەوە، دواتر ئەوەی مابووەوە لەسەر مێزەکە داینا و گوتی؛ "سەد و بیست یەن باقییەکەیە".

فوساجی باقییەکەی خستەوە ناو جزدانەکەی و گوتی؛ "سوپاس بۆ قاوەکە".

جانتا و چاکەتەکەی هەڵگرت و لە قاوەخانەکە چووە دەرەوە، وەک ئەوەی بڵێی بیری چووبێت کۆهتاکی لەگەڵدا بووە.

**تەق-تەق**

کۆهتاکی بێ ماڵئاوایی کردن لە کازوو بە دوایدا چووە دەرەوە.

**تەق-تەق**

فۆمیکۆ: "گونجاندیان، زۆر سەیر بوو پێکەوە."

کازوو سەرمێزەکەی فوساجی پاک کردەوە کە کەمێک پێش ئێستا لەسەری بوون، دواتر چووەوە چێشتخانەکە، تەنها فۆمیکۆ و ژنە کراس سپییەکە لە قاوەخانەکە مابوونەوە، ئەوەی کە پێویست بوو لەسەر فۆمیکۆ تەنها چاوەڕوانی بوو.

تەواو کێشەی یەکەم ڕۆیشت، ئێستا دەبێت چاوەڕێ بم تاکو ژنەکە لە جێگاکەی هەڵدەستێتەوە، سەرنجی لە قاوەخانەکە دەدا، هیچ پەنجەرەیەکی تێدا نییە، هەموو ئەوەی هەیە تەنها سێ کاتژمێرە بە دیوارەکەوە هەڵواسراون، هەر یەکەیان کاتژمێرێکی جیاواز پیشان دەدەن، هیچ کرپارێک نایەت و ناڕوات، هەستی بەوە دەکرد کات وەستاوە لەوێدا.

فۆمیکۆ یاساکانی بەبیری خۆی دەهێنایەوە.

یاسای یەکەم ئەوەیە تەنها دەتوانیت ئەو کەسانە ببینیتەوە لە ڕابردوو کە سەردانی قاوەخانەکەیان کردووە. ئەوەش ڕوویدا، فۆمیکۆ و گۆرۆ هاتنە قاوەخانەکە و قسەیان کرد پێکەوە.

یاسای دووەم ئەوەبوو گرنگ نییە دەگەڕێیتەوە ڕابردوو چی دەکەیت، چونکە بەهیچ جۆرێک ئێستا ناگۆڕێت، بە واتایەکی تر هەرچەندی فۆمیکۆ بگەڕێتەوە بۆ هەفتەیەک پێش ئێستا و هەوڵی ئەوە بدات گۆرۆ نەچێت بۆ ئەمەریکا ناتوانێت ڕێگری لێبکات، بیر کردنەوە لەم یاسایە فۆمیکۆی دڵتەنگ کردبوو، بەڵام قبوڵی کردبوو چونکە یاسایە.

یاسای سێیەم ئەوە بوو کە دەیگوت بۆ گەڕانەوەت بۆ ڕابردوو دەبێت تەنها لەسەر ئەو کورسییە دابنیشیت، ئەو کورسییەش لە ئێستادا ئەو ژنەی لەسەر دانیشتووە کە دیارنییە کەی هەڵدەستێت.

یاسای چوارەم دەیگوت لە کاتی گەڕانەوەت بۆ ڕابردوو دەبێت تەنها لەسەر کورسییەکە دابنیشیت و نەڕۆیت بۆ جێیەکی تر، بە هەر هۆکارێک بێت، تەنانەت ئەگەر پێویستیشت بە توالێت بوو.

یاسای پێنجەمیش دەیگوت کاتێکی دیاری کراومان هەیە، بەڵام دەربارەی ئەم یاسایە هیچ ڕوونکردنەوەیەکی پێ نەدرابوو، فۆمیکۆ کەوتە بیرکردنەوە لەنێوان یاساکاندا، هەوڵی دەدا پەیوەندی نێوان یاسای چوار و پێنج بزانێت، بەڵام بیرکردنەوەکانی بێ هوودە بوو، هەروا دەهاتن و دەچوون بێ ئەنجام، لە کۆتایدا سەری خستە سەر مێزەکە و خەوی لێکەوت.

یەکەمین جار فۆمیکۆ دوای سێیەم چوونە دەرەوەی لەگەڵ گورو ئەوەی زانی کە گورو هاندەری یارییە ئەلکترۆنییەکانە، ئەویش یاری ئێم ئێم ئار پی جییە، چونکە دروستکەری یارییەکە مامی گۆرۆیە کە بە دەستە سیحراوییەکە ناسراوە، یارییەکە زۆر بەناوبانگ بوو لە سەرانسەری جیهاندا، ئەو کاتەی گۆرۆ کوڕێکی بچووک بوو پێش زانکۆ مامی ئەم جێیەی دامەزراندبوو، ئەگەر کەسێک بیویستایە لەو کۆمپانیایە کاربکات دەبوو هەمان

بڕوانامەی گۆرۆی هەبووایە و ئەزموونی پێنج ساڵ زیاتری هەبووایە، پێشتر گۆرۆ دەربارەی ئەم خەونەی قسەی لەگەڵ فۆمیکۆ کردبوو، فۆمیکۆش زۆر دڵخۆشبوو دەربارەی، لە حەوتەم ژووانیان دا فۆمیکۆ کاتێک چاوەڕێی گۆرۆی دەکرد دوو پیاو وەستابوون کە قسەیان لەگەڵدا دەکرد، و دوو پیاوی بەڕێز بوون، بەڵام هیچ بەلای فۆمیکۆوە گرنگ نەبوو، کاتێک گۆرۆ گەیشت ئەوی بینی زۆری پێناخۆش بوو، بە فۆمیکۆی گوت کە بۆچی لەگەڵیاندا وەستاوە و قسە دەکات.

گۆرۆ هیچی تری نەگوت و تەنها سەری داخست، دواتر فۆمیکۆ بۆ ئەوەی بارودۆخەکە ڕاست بکاتەوە بە ڕووسی گوتی؛ "ئێوە ئەم کوڕە ناناسن."

بە فەرەنسی گوتی؛ "دەتوانێت چەند ئەرکێکی جیاواز بەجێ بهێنێت لە کارەکەیدا."

بە یۆنانی گوتی؛ "دەتوانێت مەحاڵ بکات بە ڕاستی."

بە ئیتاڵی گوتی؛ "دەتوانێت ئەوەی دەیەوێت بەدەستی بهێنێت."

بە ئیسپانی گوتی؛ "ئەم پیاوەی من دەیناسم لە هەموو پیاوەکانی تر تایبەتترە."

دواتر گوتی؛ "ئەگەر ئێوە لە هەر کام لەو ڕستانە تێگەیشتن کە من گووتم ئەوا من لەگەڵتاندا دێمە دەرەوە."

دوو پیاوەکە بە بێ ئومێدییەوە فۆمیکۆیان بەجێ هێشت، فۆمیکۆ بە زەردەخەنەوە ڕووی کردە گۆرۆ و گوتی؛ "گوومانم

لەوە نییە کە لەهەمووی تێگەیشتیت." ئەم جارەیان بە پورتوگالی گوتی.

گۆرۆ تەنها سەری لەقاندەوە و هیچی نەگووت.

لە دەیەمین ژووانیان دا گۆرۆ کەوتبوە بیرکردنەوەی ئەوەی پێشتر لەگەڵ هیچ ئافرەتێکدا لە ژوواندا نەبووە.

فۆمیکۆ بە خۆشحاڵییەوە گوتی؛ "کەواتە من دڵخۆشم کە یەکەمین ئافرەتم لە ژیانی تۆدا ژووانت لەگەڵ بەستبێت".

ئەو شەوە بووە سەرەتای پەیوەندییەکەیان.

فۆمیکۆ دوای ئەوەی لە خەوە کورتەکەی هەستایەوە بینی ژنە کراس سپییەکە پەرتووکەکەی داخستەوە و پاشان دەسرەکەی لە جانتا دەستییەکەی دەرهێنا و بەرەو توالێتەکە بەرێ کەوت.

فۆمیکۆ هێشتا خەو بەری نەدابوو، هەر بۆیە بە تەواوی هەستی بەوە نەکرد کە ژنەکە مێزەکەی بەجێ هێشتووە، ساتی دواتر کازوو هات تاکو مێزەکە پاک بکاتەوە بانگی فۆمیکۆی کرد؛ "خاتوون، خاتوون".

فۆمیکۆ؛ "بەڵێ، چی؟"

لە پڕا فۆمیکۆ سەری بەرزکردەوە؛ "ژنەکە ڕۆیشت."

"کورسییەکە بەتاڵە ئێستا دەتەوێت دابنیشیت؟"

"بێگومان دەمەوێت."

بەپەلە هەستایەوە سەرپێی و چوو لەسەر کورسییەکە دانیشت، بەڵام کورسییەکە ئاسای بوو، هیچ شتێکی ئەوتۆی لێ

جیاواز نەبوو وەکو لەئەوانی تر، دوای ئەوەی ئەو هەموو ماوە زۆرە چاوەڕێی کرد لە کۆتایدا نۆرەی هات.

"باشە کەواتە ئێستا بمگەڕێنەوە بۆ هەفتەیەک پێش ئێستا."

فۆمیکۆ هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی و خۆی ئامادەکرد بۆ گەشتەکەی، دواتر بیری لەو قسانە دەکردەوە کە بە گورزۆی دەگووت لە کاتی گەڕانەوەدا.

کازوو؛ "باشە کەواتە بگەڕێوە هەفتەیەک پێش ئێستا."

دوای ئەو قسەیەی کازوو، فۆمیکۆ دووبارە چاوی بە قاوەخانەکەدا گێڕا، چونکە قاوەخانەکە هیچ پەنجەرەیەک یاخود کاتژمێرێکی ڕاستی تێدا نەبوو، فۆمیکۆ تەنانەت نەیدەزانی ئاخۆ شەوە یاخود ڕۆژە، جگە لەوەی ئەگەر هەر بەڕاستی گەڕاوەتەوە ڕابردوو دەبوو گورزۆ لێرە بوایە، بەڵام گورزۆ لێرە نییە.

"من نەگەڕاومەتەوە ڕابردوو وایە؟" تکایە پێم مەڵێ من هەڵخەڵەتێنراوم بە درۆیەک کە باوەڕم پێ هێناوە و کاتم پێ بەخشیوە.

لەو قسانە دابوو کازوو لە دوایەوە دەرکەوت، سینییەکی ستیلی لە دەست بوو کە کترییەکی ڕەساسی و کوپێکی شووشەی لەسەر بوو.

"من نەگەڕاومەتەوە هێشتا؟"

بە سادەییەوە کازوو وەڵامی دایەوە؛ "تەنها یاسایەک ماوەتەوە."

بە نەفرەت بی یاساییەکی تریش ماوە، وابزانم دانیشتن لەسەر ئەم کورسییە تێچووی زۆری دەوێت.
کازوو کوپە قاوەکەی تێکرد و گوتی؛ "دەبێت قاوەیەک بخۆیتەوە."
"قاوە؟ بۆچی قاوە؟"
"کاتەکەت لەو کاتەوە دەست پێدەکات کە قاوەکە تێدەکەم... دەبێت بگەڕێیتەوە پێش ئەوەی قاوەکە سارد ببێتەوە."
هەموو ئومێدی فۆمیکۆ لەو ساتەدا بووە خۆڵەمێش؛ "چی؟! بۆچی بەو زووییە؟"
"کۆتایی و گرنگترین یاسا..."
قسەکان تەواو نابن، فۆمیکۆ هەستی بە بێزاری دەکرد؛ " ئەو هەموو یاسایە..."
کازوو کوپەکەی لەبەردەم فۆمیکۆ داناو پێی گوت؛ "تۆ گوێت لێمە؟ کاتێک دەگەڕێیتەوە ڕابردوو پێویستە تەواوی قاوەکە بخۆیتەوە بەرلەوەی سارد ببێتەوە."
"ئۆو بەڵام من هیچ حەز بە خواردنەوەی قاوە ناکەم."
کازوو لە فۆمیکۆ نزیک بووەوەو چاوی بڕییە نێوچاوی؛ "ئەمە ئەو یاسایەیە کە هەرگیز نابێت لەبیرت بچێتەوە."
"بەڕاستی؟"
"ئەگەر وا نەکەیت شتێکی زۆر ترسناک ڕوودەدات بەسەرت دڵنیابە."
"چی؟"

فۆمیکۆ کەوتە ناو بیرکردنەوەوە ئاخۆ دەبێت چی ڕووبدات، ڕاستە ئەوەی ئەو دەیکات کارێکە لە دەرەوەی یاساکانی سروشتە، بەڵام هەر بەڕاستی دەکەوێتە مەترسییەوە ئەگەر ئەو کارە بکات.

"چییە؟ چی ڕوودەدات؟"

"ئەگەر تەواوی قاوەکە نەخۆیتەوە بەرلەوەی سارد ببێتەوە."

"ئەگەر تەواوی قاوەکە نەخۆمەوە چی؟"

"ئەوا تۆ دەبیتە تارمایی و لەسەر کورسییەکە دادەنیشیت."

فۆمیکۆ بە سەرسوڕماوییەوە؛ "بەڕاستیی؟؟"

"کەواتە ئەو خاتوونەی کە لێرەدا دانیشتووە بووەتە تارمایی ..."

"یاساکانی شکاندووە؟"

"بەڵێ، دەیویست هاوسەرە مردووەکەی ببینێت، بەڵام ئاگای لە کاتەکە نەماو پێش ئەوەی بگەڕێتەوە قاوەکەی سارد بویەوە."

"دواتر بوو بە تارمایی..."

"بەڵێ."

ئەمە لەوە مەترسیدارترە کە چاوەڕێم دەکرد، فۆمیکۆ لە ناخی خۆیدا ئەم قسەیەی بە خۆی گوت، سێ یاسای بێزارکەر و ناخۆش هەبوون لەسەرەتاوە، ئێستاش بابەتەکە بەوەوە نەوەستاوە تابێت مەترسییەکە زیاتر دەبێت.

باشە بەڵام ئێستا لانی کەم دەتوانم بگەڕێمەوە ڕابردوو، بەڵام دەبێت بگەڕێمەوە بەرلەوەی قاوەکەم سارد ببێتەوە. کاتەکە زۆر ناخایەنێت، بەڵام لانی کەم هێندە دەبێت تاکو

قاوەکەم دەخۆمەوە، هەرچەندە تامی ناخۆش بێت. بەڵام ئەگەر بۆم نەخورێتەوە ئەوا دەبێت زۆر لە خۆم بکەم بۆ ئەوەی نەبمە تارمایی، کەواتە من ئەو کارە دەکەم هیچ ترسێک لە ئارادا نییە، قاوەکە دەخۆمەوە و دەگەڕێمەوە، لەو کاتەی قاوەکە تێدەکرا فۆمیکۆ هەر لە بیرکردنەوەدا بوو؛ چی دەبێت ئەگەر قاوەکە بیبەری تێکرابێت، ئەی ئەگەر تامێکی سەیری هەبێت، ئەگەر هەر بەڕاستی ناخۆش بێت؟

هەموو ئەم بیرکردنەوانە لە مێشکی دا دەخولایەوە، بەڵام ئەو سووربوو لەسەر ئەوەی کە بەسەر بیرکردنەوەکانیدا زاڵ بێت و پرسیاری تر نەکات، دواتر گوتی؛ "باشە من دەبێت قاوەکە بخۆمەوە بەرلەوەی سارد ببێتەوە وایە؟"

"بەڵێ."

کازوو بە هێمنی لەبەردەمی وەستابوو، قاوەکەی پێشکەش کرد بەبێ ئەوەی هیچ قسەیەک و کاردانەوەیەکی هەبێت، تەنانەت ئەگەر فۆمیکۆ بیگوتایە قاوەکە ناخۆمەوە و ئەو کارە ناکەم هەمان کاردانەوەی هەبوو.

"باشە من ئامادەم."

"بیرت بێت قاوەکە بخۆرەوە بەرلەوەی سارد ببێتەوە."

لەو کاتەی کازوو قاوەکەی دەکردە ناو کوپەکە فۆمیکۆ تێبینی هەڵمەکەی کرد کە لە قاوەکەوە بەرز دەبێتەوە، بەڵام هەروا هەڵمێکی ئاسایی نەبوو، بەڵکو هەڵمەکە وای کرد دەوروبەرەکەشی بگۆڕێت. فۆمیکۆ هەستی بەترس کرد، بەڵام هەوڵیدا بەسەر خۆیدا زاڵبێت.

ئەگەر شتەکە بەم جۆرە بێت ئەوا من لە نێوان ئێستا و ڕابردوودا گیردەخۆم، هەوڵیدا بەسەر دوودڵی و ڕاڕاییەکەیدا زاڵبێت و یەکەم ژووان بهێنێتەوە بیری خۆی کە گۆرۆی تێدا بینیبوو.

دوو ساڵ بەر لە ئێستا بوو لە وەرزی بەهاردا، ئەو کات تەمەنی بیست و شەش ساڵ بوو، سێ ساڵ لە گۆرۆ گەورەتر بوو، بووە کڕیاری کۆمپانیاکە، گۆرۆش لە هەمان شوێن کاری دەکرد. بەڵام فۆمیکۆ ئەو کات بۆ جێیەکی تر کاری دەکرد. فۆمیکۆ بەڕێوەبەری تەواوی پەیوەندییەکانی کۆمپانیاکە بوو.

فۆمیکۆ هەرگیز شتێکی نابەجێی نەگوتبوو بە هیچ کام لە کارمەند یاخود بەڕێوەبەرەکەشی. بە هەمان شێوەش دەوروبەرەکەی وەها بوون لەگەڵیدا. هەرچەندی گۆرۆ منداڵتر بوو لە تەمەندا، بەڵام هەر کەسێک تەماشای بکردایە پێی وابوو کە گۆرۆ گەورەترە لە فۆمیکۆ، هەر بۆیە فۆمیکۆش بە شێوازێکی فەرمیانە قسەی لەگەڵدا دەکرد. لەناو تیمەکەشدا گۆرۆ تەنانەت بچوکترین ئەندام بوو، بەڵام بەجۆرێک کاروبارەکانی بەڕێوەدەبرد کە زۆر زۆر بە تواناو لێهاتوو بوو، فۆمیکۆش پشتێکی تەواوی پێبەستبوو.

پڕۆژەکە لە کۆتاییەکەیدا بوو، بەڵام ڕێک پێش ئەوەی بگەنە ڕۆژی کۆتایی کێشەیەکی گەورە لە سیستەمەکەدا دۆزرایەوە. بەڵام ئەوەی دۆزینەوەی هۆکاری هەڵەکەی قورس کردبوو ئەوەبوو کە سیستەمەکە بۆ بابەتێکی پزیشکی بوو،

هەر کاتێکیش تەکنەلۆژیا و پزیشکی تێکەڵ دەبن ئەو کات دۆزینەوەی هۆکارەکە قورس دەبێت، چونکە وەکو ئەوە وایە بتەوێت دلۆپێک مرەکەب بگریتەوە کە لەبەرزی بیست و شەش مەترەوە هەڵدراوەتە نێو مەلەوانگەیەکەوە، لەو کاتەدا نەک ئەوان تەنها کاتیان نەبوو هۆکارەکە بدۆزنەوە، بەڵکو کاتیان نەبوو چارەسەریشی بکەن.

لە ماوەی کەمتر لە هەفتەیەکدا بەڕێوەبەرەکەیان دەگەیشت و دەبوو پرۆژەکە بەبێ کێشە ئامادە ببوایە، بەڵام چارەسەری کێشەکە بەلایەنی کەم پێویستی بە مانگێک بوو تاکو چاک بکرێت. لەو کاتەدا فۆمیکۆ بیری دەکردەوە دەبێت چی بکات، گۆرۆش تەنها بیری لەوە دەکردەوە چۆن چارەسەری بکات، هەمووان لۆمەی گۆرۆیان دەکرد و پێیان وابوو تەنها هەڵەی ئەوە دەبێت ئەو بەرپرسیارێتییەکەی هەڵبگرێت.

دوای چوار ڕۆژ لە دیار نەمانی گۆرۆ دەرکەوتەوە بەو هەواڵەی کە هۆکاری کێشەکەی دۆزیەوەتەوە.

ئەو ڕۆژە کە هاتەوە بەهیچ جۆرێک ڕیشی چاک نەکردبوو، تەنانەت بۆنێکی ناخۆشی لێدەهات، وا پێش دەچوو کە نەخەوتبێت، لە کاتێک دا تەواوی تیمەکە بە فۆمیکۆشەوە بە ئاسانی دەستیان لە کارەکە هەڵگرتبوو، بەوە ڕازی بوون کە دەست لە کارەکە هەڵبگرن، بەڵام کەس گوێی بەوە نەدا کە گۆرۆ چەندێک بەو کارەوە ماندوو بووە، جگە لەوەی ئەو چەند ڕۆژەی کە گۆرۆ نەهاتبووەوە کۆمپانیا کەسی ئاگادار

نەکردبوەوە لە بارودۆخەکە، لە کاتێکدا هەر کارمەندێک بیەوێت نەیەتەوە دەبێت بەڕێوەبەرەکەی ئاگادار بکاتەوە، بەڵام هەموان پێیان وابوو ئەو لە بەرپرسیاریەتییەکە هەڵهاتووە.

دوای ئەوەی فۆمیکۆ دانی بەوەدانا کە لەڕاستیدا هەڵەکە هی ئەو بووە، هەموو کاردانەوەی گۆرۆ بەو جۆرە بوو کە بە زەردەخەنەیەکەوە سەری بلەقێنێت و بڵێت: "کەواتە داوەتم دەکەیت بۆ خواردنەوەی قاوەیەک؟"

لەو کاتەدا فۆمیکۆ کەوتە خۆشەویستییەوە.

لە دوای ئەو ڕۆژەوە هەر کەسێک چووەوە کۆمپانیای خۆی و کاری خۆی دەکرد، بەڵام ئەوەی هەبوو لەو نێوەندەدا ئەوان زۆر بە کەمی یەکتریان دەبینی، هەر بۆیە ئەمەش وای کرد فۆمیکۆ کاتی پشووەکانی بە دەرفەت بزانێت و بانگهێشتی خواردنەوەی قاوەی بکات.

گۆرۆ بەجۆرێک بوو هەر کاتێک کارێکی بکردایە تاکو تەواوی نەکردایە وازی نەدەهێنا، ئەو کاتەی فۆمیکۆ سەردانیماڵەکەی کردبوو باسی ئەوەی بۆ کردبوو کە دەیەوێت لە ئەمەریکا دەرفەتی کارکردن بە دەست بهێنێت و چەندە بە پەرۆشە بۆ ئەو شتە. ئایا ئەو کاتەی دەرفەتی بە دەستهێنانی خەونەکەی دێتە پێشەوە کاممان هەڵدەبژێرێت، من یاخود خەونەکەی؟

ئای خودایە...

ورده ورده ئەوەی بۆ ڕوون دەبوەوە كە لەدەست دانەكەی دەبووە ڕاست، ئەوەی دەبینی كە گۆرۆ چۆن تەماشای دەكات. كات تێپەڕی و گەیشتنە ئەو بەهارەی كە گۆرۆ دەرفەتی كاركردنی لە ئەمەریكاوە بۆ هات، لەكۆتایدا خەونەكەی هاتە دی. دوودڵییەكانی فۆمیكۆ دەستیان بە زیادبوون كرد، گۆرۆ ئەوەی هەڵبژارد بچێت لە ئەمەریكا كار بكات، ئێستا فۆمیكۆ هەست بەوە دەكات لەنێو چ خەونێكدا ژیاوە ئەو هەموو ماوەیە.

دوای ئەوەی چاوەكانی كردوە گەیشتە شوێنی مەبەست، لەبەردەم گۆرۆ دانیشتبوو ڕاستەوخۆ، دوای ئەوەی گەڕایەوە ڕابردوو سەرنجی وردەكاری قاوەخانەكەی دەدا، بە تەواوی هەموو شتەكان لەو كاتە دەچوون كە هەفتەیەك بەر لە ئێستا بوو، لەو كاتەدا پیاوەكەی ناوی فوساجی بوو، لە جێی خۆی دانیشتبوو، هیرای لای كورسی مێزی ژمێریارەكە دانیشتبوو، تاكە شت كە لە جێی خۆی نەبوو فۆمیكۆ بوو كە جێگەكەی گۆڕابوو. بەرانبەری گۆرۆ دانیشتبوو، كازوش هەر لە جێی خۆی بوو.

هەفتەیە لەمەو پێش لە مێزەكەی ئەولاتر دانیشتبوون، بەڵام ئەم هەفتەیە فۆمیكۆ ڕاستەوخۆ لەو جێیە دانیشتووە كە ژنە كراس سپییەكەی لێدانیشتوووە. گۆرۆ زۆر لە فۆمیكۆوە دووربوو، بەڵام بەپێی یاساكان نەدەبوو فۆمیكۆ كورسیەكەی خۆی جێ بهێشتایە، هەر بۆیە فۆمیكۆ بیری دەكردەوە ئەگەر گۆرۆ پرسیاری كرد بۆچی من لێرە دانیشتووم چی وەڵام بدەمەوە؟

"ئای خودایە ئەوە کات چەندە؟ من دەبێت بڕۆم".

گۆرۆ هیچ پرسیاری دەربارەی جێگاکە نەکرد، هەمان قسەی دووبارە کردەوە کە هەفتەی پێشوو گوتبووی.

"ئۆو باشە دەزانم تۆ کاتی زۆرت نییە دەبێت بڕۆیت."

"چی؟"

"ببورە".

قسەکانیان هیچ یەکی نەدەگرتەوە، فۆمیکۆ تێگەیشت ڕابردوو بەو جۆرە دەڕوات کە تێپەڕیووە.

بۆ ئەوەی مێشکی بهێنێتەوە سەرخۆی تەماشایەکی چاوەکانی گۆرۆی کرد، پاشان لە کوپە قاوەکەی دەڕوانی ئۆو هێشتا زۆر گەرمە.

هەرچەندە ئەو قاوەیە ئەو جۆرانە بوو کە فۆمیکۆ هیچ ئارەزووی لێنەدەکرد، بە ناچاری کوپەکەی هەڵگرت و بە ڕقەوە تەماشای کازووی دەکرد کە بەو جۆرە ئامادەی کردبوو، چونکە تەنها قاوەی سادە بوو هیچی تر.

"ئیو...زۆر تاڵە".

تامەکەی زۆر لەوە تاڵتربوو کە فۆمیکۆ چاوەڕێی دەکرد، بەڕای ئەو ئەوە تاڵترین قاوەبوو کە تا ئێستاکە خواردبێتییەوە، گۆرۆ بە سەرسوڕماوی تەماشای دەکرد بێ ئەوەی هیچ بڵێت.

گۆرۆ برۆیەکی هەڵتەکاند، پاشان بە نیگەرانی تەماشای کاتژمێرەکەی کرد، فۆمیکۆ تێگەیشت ئەویش بەپەلەیە.

فۆمیکۆ گوتی؛ "شتێکی گرنگ هەیە دەبێت پێت بڵێم."

فۆمیکۆ کەوچکێک شەکر و کەمێک شیری کردە ناو قاوەکەی، پاشان تێکەڵی کرد.

گۆرۆ: "چییە؟"

فۆمیکۆ نەیدەزانی هەر بەڕاستی گۆرۆ مەبەستی ئەوەیە بابەتە گرنگەکە چییە، یاخود مەبەستی شەکرە زیادەکەیەتی.

"ئەوەی مەبەستمە ئەوەیە کە... دەمەوێت شتێکی گرنگت پێ بڵێم."

گۆرۆ دووبارە تەماشای کاتژمێرەکەی کردەوە.

"یەک چرکە بوەستە..." قومێکی گەورەی لە قاوەکەی دا، فۆمیکۆ لەو کاتانەوەی کە ژووانی لەگەڵ گۆرۆ بەستبوو فێری قاوە خواردنەوە بووبوو، چونکە تەنها لەگەڵ ئەودا قاوەی دەخواردەوە، دواتر فۆمیکۆ بە زەردەخەنەیەکی گەورەوە؛ "هێی تۆ پێم دەڵێیت گفتوگۆکە گرنگە، بەڵام کاتەکە بە قاوە خواردنەوە بەسەر دەبەیت"؟!

"نا بەو جۆرە نییە."

"وەها دەردەکەوێت، ئەگەر بە دڵت نییە دەتوانیت شتێکی تر داوا بکەیت."

فۆمیکۆ دووبارە کەوتەوە ناو بیرکردنەوە، دووبارە هەمان ئەو قسانە دەکرایەوە کە هەفتەیەک پێش ئێستا کردبووی گۆرۆ، دووبارە بە قسەی منداڵانە خەریکە لە خۆی دووردەخاتەوە.

گۆرۆ لە کورسییەکەی هەستایەوە، پاشان بانگی کازووی کرد لە پشت مێزی ژمێریارەکەوە وەستابوو.

"ببورە ... چەندی کرد ئەرک نەبێت؟"

فۆمیکۆ دەیزانی ئەگەر شتێک نەکات ئەوە گۆرۆ دوای ئەوەی پارەکە دەدات دەڕوات.

"بوەستە!"

"باشە، با واز لە هەموو ئەمانە بهێنین."

"من بۆ ئەوە نەهاتووم ئەمە بڵێم."

"چی؟"

"کەواتە بۆچی پێم ناڵێیت؟"

نامەوێت بڕۆیت.

"باشە ئەمە..."

دەزانم کارەکەت چەندێک بەلاتەوە گرنگە و چەندە مەبەستتە بچیت بۆ ئەمەریکا، منیش ڕێگات لێناگرم بێگوومان."

(پێم وابوو بۆ هەمیشە پێکەوە دەبین.)

"بەلام لانی کەم..."

(من تەنها کەس بووم کە بیرم لەمە کردۆتەوە؟)

"دەمەوێت لەگەڵمدا بڕیار بدەیت. دەزانیت، چونکە بڕیارێکی خۆپەرستانەیە بێ من بڕیار بدەیت..."

(باشە لە ڕاستیدا.)

"ئەوە تەنها ... باشە تۆ دەزانیت."

(... خۆشم دەوێیت.)

"ئەوە وا دەکات خۆمم لەبیر بچێتەوە..."

"..."

"ئەوەی دەمەویت بیلێم ئەوەیە..."

"..."

(ئەوە هیچ شتێک ناگۆڕێت...)

"باشە... ئەوەی دەمویست بیلێم ئەوەیە کە"...

هەرچەندە فۆمیکۆ بڕیاری دابوو بە ڕاستگۆیانە قسەی لەگەڵدا بکات، بەڵام هێشتا ئەوەش وای نەدەکرد ئێستای بگۆڕێت، بەڵام لە لایەکی ترەوە هەستی بە شەرم دەکرد ئەگەر بیگووتبایە کاممان هەڵدەبژێریت من یاخود کارەکەت؟ چونکە گۆرۆ هەمیشە کارەکەی بۆی لەپێشتر بوو. هەروەها نەیدەویست لە شەرم و شکۆی خۆی بدات، چونکە ئەو کوڕە بە تەمەن سێ ساڵ لەم منداڵتربوو. هەر چۆنێک بێت ڕاستییەکانی نەگووت... تازە کاتەکە درەنگ بووبوو.

"باشە کەواتە بڕۆ...هەرچۆنێک بێت...من ڕێگریت لێناکەم تاکو بچیت بۆ ئەمەریکا".

دوای ئەو قسەیە فۆمیکۆ بە قومێک هەموو قاوەکەی تەواو کرد؛ "چییە؟"

کاتێک قاوەکە تەواوبوو دووبارە هەستی کرد بەرچاوی تاریک دەبێتەوە و دونیا لەبەرچاوی دەگۆڕێت.

ئەو پرسیارە لە مێشکیدا دەخولایەوە؛ (من بۆچی گەڕامەوە بە تەواوی؟)

"هەرگیز پێم وانەبووە ئەم پیاوە پیاوە ڕاستەکە بێت بۆتۆ".

نەیدەزانی گۆرۆ بۆچی وای نەگووت.

"هەر کاتێک بانگهێشتی قاوەت دەکردم بە خۆمم دەگوت... هەرگیز نابێت بکەومە خۆشەویستییەوە لەگەڵ تۆدا..."

"چی؟"

"چونکە من ..."

گۆرۆ دەستێکی بە قژیدا هێنا و دەستەکانی خستەوە ناو یەک، پاشان گوتی؛ "چونکە هەمیشە پێم وابووە لەلایەن ئافرەتانەوە نەویستراوم".

"من...".

"تەنانەت دوای یەکەم ژووانیشمان."

فۆمیکۆ هاواریکرد؛ "ئەوە هەرگیز بێزاری نەکردووم".

فۆمیکۆ هەرچەندی دەیزانی دەنگی پێی ناگات، بەڵام بەردەوام بوو لە تەواوکردنی ڕستەکەی و گوتی؛ "بەلای منەوە پێش ئەوەی بەدڵی کەس بیت تۆ باشترین کوڕیت کە تا ئێستاکە دیبێتم."

(هەرگیز... چۆن دەتوانیت بەو جۆرە بیر بکەیتەوە!)

"هەمیشە پێم وا بووە کە..."

(هەرگیز!)

بابەتەکە بۆ فۆمیکۆ پڕ لە شۆک بوو کە بەو جۆرە بێت، هەرچەندی زیاتر گۆرۆی خۆشبوویستایە زیاتر بابەتەکە پڕشۆک دەبوو.

ئەو کاتانەی فۆمیکۆ بە گۆرۆی دەگووت خۆشم دەوێیت هەموو ئەوەی گۆرۆ دەیکرد تەنها سەری دەلەقاند و هیچی

تری نەدەگووت، تەنانەت ئەو کاتانەشی کە بە شەقامەکەدا پیاسەیان دەکرد زۆربەی کاتەکان گۆرۆ سەری داخستبوو، کاتێک پیاوەکان تەماشای فۆمیکۆیان دەکرد گۆرۆ برۆیەی بەرز دەکردەوە وەک هێمای توڕەبوون و هیچی نەدەگووت.

(بێگومان هیچی نەدەگووت دەربارەی.)

بەو جۆرە هەستکردنەی گۆرۆ وای کرد فۆمیکۆ هەست بە شەرمەزاری بکات.

(پێم وا نەبوو بەو جۆرە بیر بکاتەوە.)

فۆمیکۆ تەواوی ئاگایی لە دەست دابوو، چونکە بەتەواوی ئەوە ڕووی دەدا کە دەبوو ڕووبدات، گۆرۆ پسولەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت.

(ئێستا بە هیچ جۆرێک ناگۆڕێت ڕابـردوو، هەرچەندە بگۆڕێت ئێستا ناگۆڕێت، گۆرۆ خەونەکەی هەڵبژارد وەک لە من، ئەو بڕیارە ڕاستەکەی دا. پێم وایە دەبێت واز لە گۆرۆ بهێنم و بە تەواوی دڵمەوە قبوڵی بکەم کە ئەو دەڕوات).

فۆمیکۆ بە بێ ئومێدییەوە چاوەکانی داخست، گۆرۆ گوتی: "سێساڵی تر".

"تکایە چاوەڕێم بکە سێ ساڵی تر دەگەڕێمەوە بەڵێن بێت."

هەرچەندی قاوەخانەکە خەڵکی تری تێدابوو، بەڵام فۆمیکۆ دەیتوانی بە ڕوونی ئەو قسەیەی گۆرۆ ببیستێت. "بوەستە چی؟"

هەموو هەستەکانی فۆمیکۆ هاتنەوە بەردەمی، کاتەکە گەیشتبووە ئەوەی کە گۆرۆ قاوەخانەکە بەجێبهێڵێت، لەو

کاتەدا گوتی؛ "بێگومان دەبێت ئەو کاتە قاوەشم بۆ بکڕیت ئەی وانییە؟"

کاتێک گەڕایەوە لای فۆمیکۆ، فۆمیکۆ بە تەنها لەسەر کورسییەکەی دانیشتبوو کوپەکەی بەردەمی بەتاڵ بووبوو، هەرچەندی هێشتا تامی شیرینی قاوەکە لە دەمیدا مابوەوە.

هەرلەو کاتەدا خاتوونە کراس سپییەکە لە توالێتەکە هاتە دەرەوە.

کە بینی فۆمیکۆ لە جێگەکەی دانیشتووە هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو، جگە لەوەی لەبەردەمیدا بوەستێت و چاوەڕێ بکات بە بێدەنگی.

دەنگێکی نزم گوتی؛ "هەستە!"

فۆمیکۆ بە شڵەژاوییەوە؛ "ئۆو ببورە تکایە!"

هەستی دەکرد خەونی دیوە، ئایا هەر بەڕاستی گەڕایەوە ڕابردوو؟

گەڕانەوە بۆ ڕابردوو هیچی لە ئێستا نەگۆڕیبوو، تەنانەت لە گەڕانەوەشی دا کازوو هیچ پرسیارێکی لێنەکرد، کازوو وەکو پیشەی هەمیشەیی خۆی سینیەکی بە دەستەوە بوو، کوپەکەی فۆمیکۆی خستە سەر، پاشان بردیەوە لای مێزی ژمێریارەکە، دواتر کوپە قاوەیەکی تازەی لە بەردەم خاتوونە کراس سپیەکە دانا، ئەویش سوپاسی کرد، پاشان هەموو ئەوەی کازوو پرسی تەنها ئەمە بوو؛ "چۆن بوو؟"

بەو قسەیە فۆمیکۆ دڵنیا بوەوە کە گەشتی کاتیی ئەنجامداوە؛

"تەنها بیردەکەمەوە کە..."

"بەڵێ؟"

"بەهیچ جۆرێک ئێستای نەگۆڕیوە وایە؟"

"بەڵێ وایە."

"ئەی دەربارەی ئەو شتانەی دواتر ڕوودەدەن"؟

"نازانم بەتەواوی مەبەستت چییە؟"

"لە ئێستا بەدواوە... مەبەستم دەربارەی داهاتووە".

"هممم باشە... بەو پێیەی کە داهاتوو هێشتا ڕوویندداوە کەواتە ئەوە لەسەر تۆیە کە دەتەوێت چی تێدا ڕووبدات."

کازوو بەڕێزەوە گوتی خزمەتگوزاری قاوەکە و قاوەخانەکە چوارسەد و بیست یەنە تکایە."

فۆمیکۆ گەڕایەوە لای جانتاکەی و پارەکەی لەسەر مێزەکە دانا.

"سوپاس."

هەردووکیان زەردەخەنەیان گۆڕیەوە، پاشان فۆمیکۆ چاوی بە قاوەخانەکەدا گێڕا و چووە دەرەوە.

خاتوونە کراس سپییەکەش لە جێی خۆی دانیشتبوو پەرتووکەکەی کردەوە، کە ناونیشانەکەی بە ناوی خۆشەویستەکان بوو.

کازووش وەها ڕەفتاری دەکرد کە هیچ ڕوویندابێت.




**Description**

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و  بابەتی جیاواز🤍

**ئەم کتێبە لەلایان سارا نامیق کراوە بەpdf**
**پێویستی بە دوعایە دوعای خێری بۆ بکەن**

چەنال
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ  کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7

II
## ژن و مێردەکە

لەبەر ئەوەی سەردەمی کرانەوەی قاوەخانەکە دەگەڕایەوە بۆ ساڵی ٤٧٨١، بۆیە هیچ هۆکارێکی فێنککەرەوەی نەبوو، وا نزیکی سەد و چل ساڵ دەبێت قاوەخانەکە بوونی هەیە. سەرەتا خەڵکەکەی چرای نەوتیان بەکاردەهێنا، بەڵام دواتر هەندێک وردە گۆڕانکاری لە قاوەخانەکەدا کرا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو گۆڕانکارییانە کاری نەکردبووە سەر دیمەنەکەی، چونکە هەر بە کۆنی مابوەوە، هەر وەک یەکەم جار دروستکرابوو. تا ساڵی ٨٨٨١یش، واتە بۆماوەی چواردە ساڵ بە یەکێک لە قاوەخانە مۆدێرنەکانی ژاپۆن ناوزەند دەکرا.

لە ماوەی ئیدیۆ ژاپۆندا قاوە هاتە نێو ژاپۆنەوە لە کۆتایی سەدەی حەڤدەدا بوو. سەرەتا خەڵک زۆر ئارەزووویان نەدەکرد، بەڵام دواتر خواستێکی زۆری لەسەر بوو، چونکە بۆ ئەوان وەکو ئاوێکی ڕەشی تاڵ وابوو.

دوای ئەوەی کە کارەبا داهێنرا و پێویست بوو گڵۆپ دابنرێت و فێنککەرەوە دابنێرێت، گڵۆپەکانیان بە ئاسانی دانا.

بەلام دەربارەی فێنککەرەوەکە هیچیان نەکرد، چونکە بەو جۆرە دیکۆری ناو قاوەخانەکەی تێکدەدا.

کە هاوین دەهات دوای ئەوەی پلەکانی گەرما دەگەیشتە سی پلەی سیلیزی، دەبوو پانکەی ئەرزی دابنرایە لەنێو قاوەخانەکە، لەبەر ئەوەی جێگەی قاوەخانەکە ژێرزەمینێک بوو، بۆیە بەشی پێویست فێنک دەبویەوە، لەو سالانەی دواییدا پلەی گەرمی لە ئیکواساکی دەگەیشتە ١٤ پلەی سیلیزی، بەلام کە دەچوویتە نێو قاوەخانەکە هەستت بە فێنکی دەکرد، هۆکارەکەشی پانکەکە نەبوو، بەلکو شتێکی تر بوو کە جگە لە ئەندامەکانی ستافی قاوەخانەکە کەسی تر هۆکارەکەی نەدەزانی.

دوانیوەڕۆیەکی ڕۆژی سەرەتای هاوین بوو، خاتوونێکی گەنج لە نزیک مێزی ژمێریارەکە دانیشتبوو سەرقالی نوسین بوو، لە تەنیشت تێنوسە پەمەییەکەیدا پەرداخێک قاوەی ساردی پڕ سەهۆلی لابوو، خاتوونەکە کراسێکی سپی و تەنورەیەکی کورتی تەسکی ڕەساسی و جووتێک پێلاوی هاوینەی لەپێدا بوو. جارجار پێنوسەکەی لەنێو پەنجەکان دەهێناو دەبرد، بیری دەکردەوە و پاشان هەندێک شتی لەسەر کاغەزەکە دەنووسی.

لەودیو مێزەکە خاتوونێکی لاوازی مندالکار وەستابوو، جارجارە کاغەزەکەی بەردەمی دەخوێندەوە، بەلام خوێندەوەی کاغەزەکە هیچ شەرمێکی بۆ ئەو تێدا نەبوو، چونکە هەر خۆی بابەتەکانی دەزانی، ئەم خاتوونەیان ناوی کی تۆکیتا بوو.

بێجگە لەو خاتوونەی سەرقاڵی نوسین بوو لە یەکێک لە مێزەکان خاتوونێکی تر دانیشتبوو، کە کراسێکی سپی هاوینەی لەبەردابوو، لەولاتریش لە نزیک دەرگاکە پیاوێک دانیشتبوو بەناوی فوساجی، گۆڤارێکی گەشتوگوزاری بەدەستەوەبوو.

خاتوونەکە هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی و کی-ش لەگەڵیدا هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی، پاشان گوتی؛ "ببورە لێرە زۆر مامەوە"، پاشان کاغەزەکەی خستە نێو زەرفی نامەکە. .

کی؛ "هیچ کێشەیەک نییە." هەستایەوە سەرپێ و گوتی؛ "همم ... پێت وایە بتوانیت ئەمە بگەیەنیت بە خوشکەکەم؟"

خاتوونەکە بە پەرۆشی و بەڕێزەوە نامەکەی دا بە کی. خاتوونەکە ناوی کومی هیرای بوو، خوشکە بچوکی یۆکۆ هیرای بوو کە لە نزیک قاوەخانەکەدا باڕ و فرۆشگایەکی بچووکی هەبوو.

کی بە زەردەخەنەوە نامەکەی وەرگرت؛ "ئۆو بێگومان ئەگەر خوشکەکەت بناسمەوە ...".

کومی؛ "دەزانم ڕەنگە نەیخوێنێتەوە، بەڵام ئەگەر توانیت ..." سەری داخست.

کی وەکو ڕەفتاری هەمیشەیی بەڕێزەوە گوتی؛ "بێگومانبە ئەنجامی دەدەم".

دوای وەرگرتنی نامەکە کی هەستی دەکرد پەیامێکی زۆر گەورەی وەرگرتووە کە دەبێت بیگەیەنێت، پاشان کومی چووە لای کاشێرەکە؛ "چەندی کرد؟"

کی نامەکەی لەسەر مێزەکە دانا و پاشان قوفڵی ئامێرەکەی کردەوە.

ئامێری کاشێرەکە زۆر کۆن بوو، کە دەگەڕایەوە بۆ سەرەتاکانی دروست بوونی قاوەخانە، ئامێرێکی گەورەبوو، کێشی بەنزیکەی چل کیلۆگرام دەبوو، دوگمەکانی گەورە و بەرزبوون، لەگەڵ داگرتنی هەر دوگمەیەکدا کرتەیەکی گەورەی دەکرد کە بە ئاسانی دەتتوانی گوێبیستی ببیت.

کی دانە دانەی شتەکانی دەژمارد؛ "قاوەیەک ... تۆستێک ... برنج ... سۆدەیەک ... پیزایەک ...".

تەق تەق ... تەق تەق. کی دانە دانە نرخی هەر دانەیەکی دەنووسی؛ "ئایسکرێمم... پیزایەکی داخراو...".

کومی هەستی کرد کە چەندە زۆری خواردووە لەو ماوەیەی دانیشتووە، چونکە شتەکانی لە پسوڵەکەدا جێیان نەدەبووەوە. کی پسوڵەی دووەمی ڕاکێشا؛ "برنج بە کاری ... شەربەتی مۆز ... برنج بە ..." کارەکە گرنگ نەبوو، شتەکان دانە دانە بخوێنێتەوە بەڵام کی هەر دەیخوێندەوە وەکو منداڵێک چێژی لەو یاریکردنە دەبینی.

"دواتر داوای پاستایەکی مریشک و ئایسکرێمێکی ئەنەناست کردووە و ..."

"تەواوی مینوەکەم داوا کردووە کەوایە".

کەمێک بە دەنگی بەرز گوتی، وەکو ئاماژەیەک تاکو بڵێت تکایە نامەوێت بیخوێنیتەوە.

"بەڵێ."

ئەوە دەنگی کی نەبوو، بەڵکو دەنگی فوساجی بوو کە وای گوت، پێدەچوو گوێی لە خوێندنەوەی پسوڵەکە بووبێت. کی هیچ گوێی پێنەدا، بەڵام کومی لە شەرمدا سوور بوەوە، گوتی؛ "چەندی کرد"؟ بەڵام وا پێدەچوو کی تەواو نەبووبوو هێشتا.

"ئا، با ببینین ... ساندوجێکت داوا کردووە ... شەربەتی هەنار...دووبارە برنج بە کاری...و قاوەیەک هەمووی کردییە دوو هەزار و دوو سەد و سی یەن."

کی زەردەخەنەیەکی میهرەبانانەی گۆڕییەوە لەگەڵ کومیدا.

کومی پارەکەی دەرهێنا لە جزدانەکەی و دای بە کی، کی پارەکەی ژمارد و گوتی؛ "یانزە هەزار بگرە"، کومی چاوەڕێی تەواوی پارە ماوەکەی بوو، کی پارەکەی بۆ تەواو کرد و پاشان دایە دەستی، پاشان حەوت سەد و حەفتا یەنی لەسەر مێزەکە دانا.

کومی؛ " سوپاس، خواردنەکانیش بەتام بوون."

کومی بەپەلە بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت، چونکە دەیویست هەرچی زووە لە قاوەخانەکە بچێتە دەرەوە، هەستی بە شەرمەزاری دەکرد دەربارەی ئەو هەموو خواردنەی خواردوویەتی، بەڵام کی ڕایگرت؛ "کومی...خولەکێک بوەستە."

کومی ئاوڕی دایەوە.

"دەربارەی خوشکەکەت ... ئایا هیچ قسەیەک هەیە بتەوێت من بە ئەوی بگەیەنم؟"

"نەخێر، هەموو ئەوەی پێویست بوو لەناو نامەکەدا بۆم نوسیووە."

کی بە نائومێدییەوە؛ "بەڵێ، خۆشم ئەو گریمانەیەم دانابوو."

دوای خولەکێک لە بیرکردنەوە کومی گوتی؛ "بەڵام شتێک هەیە کە دەتوانیت پێی بڵێیت ..."

کی بە خۆشحاڵییەوە؛ "بەڵێ، بەدڵنیاییەوە."

"پێی بڵێ کە چیتر دایە و بابە تورەنین."

"دایک و باوکت چیتر تورەنین."

"بەڵێ ... بەڵام تکایە پێی بڵێ."

کی دووجار سەری راوەشاند؛ "بەڵێ بێگومان پێی دەڵێم."

کومی بۆ کۆتاجار چاوی بە قاوەخانەکەدا گێرا، پاشان بەرێزەوە ماڵئاوایی لە کی کرد و رۆیشت.

## تەق-تەق

کی چووە دەرەوە تاکو دڵنیابێتەوە ئایا کومی رۆیشتووە یاخود نا، دواتر گەرایەوە ژوورەوە و دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵ ژمێریارە نادیارەکە؛

"تۆ لەگەڵ دایک و باوکت شەرت کردووە؟"

پاشان کەسێک بە هەناسەبرکێ لەژێر مێزەکە هاتە دەرەوە و گوتی؛

"ئەوان حاشایان لێکردووم."

"بەڵام قسەکانت بیست وایە؟"

"چیم بیست؟".

"دایک و باوکت چیتر لێت تووڕە نین."

"تەنها ئەوکاتە باوەڕ دەکەم کە بەچاوەکانی خۆم ئەوە ببینم ..."

هیرای لەژێر مێزەکە هاتە دەرەوە، بەهۆی ئەوەی ماوەیەکی زۆر لەژێر مێزەکە مابوەوە بە تـەواوی پشتی چەمابوەوە، ڕاستەوخۆ بەرەو چێشتخانەکە چوو وەکو خووی هەمیشەیی خۆی.

"خوشکەکەت زۆر جوانە".

"ئەگەر لە جێی من بوویتایە هەمان شتت نەدەگووت."

هـیرای چـووە ئـەو جێیەی کـە کومی لێی دانیشتبوو، دانیشت جگەرەیەکی دەرهێنا و دایگیرساند، جگەرەکەی بۆنی گوڵی لێدەهات، کی بەرانبەر هیرای وەستابوو، لەودیو مێزی ژمێریارەکەوە گوتی؛ "دەتەوێت دەربـارەی ئەو بابەتە قسە بکەیت؟"

قومێکی تری دا لە جگەرەکەی و گوتی؛ "ئەو بێزارم دەکات."

کی؛ "مەبەستت چییە لەوەی کە بێزارت دەکات؟"

"دەیەوێت لەگەڵیدا بم".

کی بە سەرسوڕمانەوە گوتی؛ "هممم؟"

هیچ بیرۆکەیەکی نەبوو ئاخۆ هیرای باسی چی دەکات.

"میوانخانەکە ..."

خێزانەکەی هیرای میوانخانەیەکی بەناوبانگ و گرانبەها

بەڕێوە دەبەن لە سێندای، بەجۆرێک بە تەواوی ناوبانگەکەی لە سێندای دەنگی دابووەوە، دایک و باوکی هیرای دەیانویست هیرای میوانخانەکە بەڕێوە ببات، بەڵام هیرای ئەوەی ڕەت دەکردەوە، سیانزە ساڵ بەرلە ئێستا هەر بۆیە کومی زۆربەی بەرپرسیارییەتییەکانی میوانخانەکەی گرتبووە دەست لە کۆتایدا و ببوە جێگرەوە، دایک و باوکی هیرای گەنج بوون، بەڵام بیریان لە داهاتوو کردبووەوە، هەر بۆیە بە دوای جێگرەوەیەکەدا دەگەڕان، لە دوای ئەوەی کومی بەرپرسیارییەتیەکانی گرتە دەست، بڕیاریدا بچێت بۆ تۆکیۆ تاکو خوشکەکەی قایل بکات لەگەڵیدا میوانخانەکە بەڕێوە ببات.

"هەمیشە پێم گووتووە کە من نامەوێت بگەڕێمەوە ماڵەوە، بەڵام هەموو جارێک دێتە ئێرە و هەراسانم دەکات."

"بەڵام پێویستیش ناکات خۆتی لێبشاریتەوە."

"نامەوێت چاوم پێی بکەوێت."

"چی ببینیت؟"

"دەموچاوی."

کی بە فزوڵییەتەوە لێی چووە پێشەوە تاکو زیاتر بزانێت.

هیرای؛ "بەڕوونی ئەوە دەبینم لەسەر دەموچاوی ئەو دەیەوێت من بگەڕێمەوە بۆ بەڕێوەبردنی میوانخانەکە، تەنها لەبەر ئەوەی ئەو ئازاد بێت و بسوڕێتەوە."

کی بە سەرسوڕماوییەوە گوتی؛ "تێناگەم چۆن ئەم هەموو شتە لەسەر دەموچاوی نوسراوە."

هیرای دەیزانی لەبەر ئەوەی کی بەباشی خوشکەکەی ناناسێت بۆیە ناتوانێت وێنای ئەو هەموو شتە بکات پێکەوە.

"ئەوەی مەبەستمە بیڵێم ئەوەیە کە ئەو پەستانم لەسەر دروست دەکات."

دووبارە قومێکی تری لە جگەرەکەی دەستیدا و چەند جارێک ملی تەقاند، پاشان گوتی: "ئای خودایە کاتژمێر چەندە، دەبێت ئێستا بارەکە بکەمەوە؟" بەپەلە بەرەو لای دەرگاکە ڕۆیشت.

کی بەپەلە نامەکەی هەڵگرت و بەدوایدا ڕۆیشت: "ئۆو خولەکێک چاوەڕێ بکە! نامەکە."

هیرای بەبێ ئەوەی تەماشاشی بکات: "فڕێی بدە!"

"ناتەوێت بیخوێنیتەوە؟"

"دەزانم چی نووسیوە، ناتوانم بە تەنها شوێنەکە بەڕێوە ببەم، تکایە بگەڕێوەماڵەوە. تێدەگەم کە چەندە سەختە بۆت. دڵنیام قسەکانی هەر ئەم بابەتانەیە."

هیرای بە دەم قسەکردنەوە جزدانەکەی دەرهێنا و پارەی قاوەکەی لەسەر مێزەکە دانا: "دەتبینمەوە."

دواتر ڕاستەوخۆ قاوەخانەکەی بەجێهێشت.

**تەق–تەق**

کی ڕاستەوخۆ تەماشای نامەکەی کرد و چاوی لەسەر ڕێگای هیرای بوو، پاشان بە خۆی گوت: "ناتوانم فڕێی بدەم."

**تەق–تەق**

لەو کاتەی کی بەو جۆرە وەستابوو لەگەڵ خۆیدا قسەی دەکرد، زەنگی دەرگاکە لێیدا و کازوو تۆکیتا هاتە ژوورەوە بۆ ناو قاوەخانەکە.

کازوو ئەمڕۆ لەگەڵ ئامۆزای خاوەنی قاوەخانەکە چووبوونە دەرەوە تاکو پێداویستییەکانی قاوەخانەکە بکڕن. کازوو کۆمەڵێک زەرفی بازاڕکردنی بەدەستەوە بوو، پڕ بوون. وەکو جلوبەرگی هەمیشەیی کازوو؛ تیشێرتێک و پانتۆڵێکی کاوبۆی لەپێدا بوو. دواتر بەرۆانکەیەکی کارکردنی دەبەست.

کی بەزەردەخەنەوە پێشوازی لێکردن؛ "بەخێربێنەوە."

"ببورە زۆرمان پێچوو".

"نا بە پێچەوانەوە زۆر باشبوو."

کازوو؛ "دەچم خۆم دەگۆڕم و دەگەڕێمەوە." کازوو ڕاستەوخۆ بەرەو ژوورەکەی دواوە ڕۆیشت.

کی هێشتا نامەکەی بە دەستەوە بوو گوتی؛ "ئەم هاوسەرە نەفرەتییەی من لە کوێیە؟"

ناگاری ناتوانێت بە تەنها بچێتە بازاڕ و ئەو هەموو کەلوپەلە بکڕێت، چونکە یاخود هەندێکی بیر دەچێتەوە، یاخود دەستی ناکەوێت، هەندێکجاریش پارەی زیاتر خەرج دەکات وەک لە پێویست، هەر بۆیە دەبێت کازوو لەگەڵیدا بچێت، هەندێک جاریش لە ڕێدا لا دەدات و دەخواتەوە.

کازوو گوتی کە ناگاری گووتویەتی؛ "بێگومان دوادەکەوم."

"ئۆو دڵنیام چووە بۆ خواردنەوە دووبارە."

"ئێستا تەماشا دەکەم."

هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و گوتی: "ئۆف باوەڕ بەم پیاوە ناکەم!" پاشان چووە چێشتخانەکە، قاوەخانەکە تەنها خاتوونە کراس سپییەکە و فوساجی لێبوو، هەردووکیان قاوەی گەرمیان دەخواردەوە، هەرچەندی کەشەکەی گەرمیش بوو.

دوو هۆکار هەبوو کە هەردووکیان قاوەی گەرمیان دەخواردەوە، یەکەمیان ئەوەبوو باشتر یارمەتی کەمکردنەوەی دوودڵی و ڕاڕایی دەدا، دووەمیشیان ئەوە بوو قاوەخانەکە لەناوەوە فینک بوو. کازو جلی کارکردنی لەبەر کردەوە و گەڕایەوە سەر کارەکەی.

چونکە گەرمای هاوین دەستی پێکردبوو، پلەی گەرما گەیشتبووە سی پلەی سیلیزی و کازووش ئەمڕۆ نزیکەی سەد مەترێک بەپێ ڕۆیشتبوو، بۆیە بە تەواوی دەموچاوی ئارەقەی کردبوەوە، دەسترەکەی دەرهێناو دەموچاوی سڕی.

فوساجی سەری لەسەر گۆڤارەکەی بەرزکردەوە و گوتی: " ببورە ..."

کازوو بە سەرسوڕمانەوە: "بەڵێ، فەرمووو؟"

"دەتوانیت قاوەکەم بۆ تازە بکەیتەوە؟"

"ئۆو بەڵێ بێگوومان."

فوساجی چاوی لەسەر کازوو لانەبرد، تاکو چووە چێشتخانەکە، فوساجی یەکێک بوو لە کڕیارە هەمیشەییەکان، هەمیشە لە یەک جێگادا دادەنیشت، تەنانەت ئەگەر کەسێکی

تر لەو جێیە دابنیشتایە ئەوا بێگومان دەڕۆیشت ڕاستەوخۆ. هەمیشە گۆڤارێکی گەشتوگوزاری بەدەستەوە بوو لاپەڕە بە لاپەڕە دەیخوێندەوە، کاتی هاتنەکەی بەم جۆرە بوو، دوای نانی نیوەڕۆ هەفتەی دوو بۆ سێ جار سەردانی قاوەخانەکەی دەکرد تاکو گۆڤارەکەی تەواو نەکردایە نەدەڕۆیشت، جگە لەوەش تاکە شت کە داوای دەکرد قاوەی سادە بوو.

قاوەی قاوەخانەکە لە مۆکا دروست دەکرا کە لە ئەسیوبیاوە دەهێنرا، بۆنێکی خۆشی هەبوو، بەڵام هەمووان حەزیان بەو تامەی نەدەکرد، چونکە لەچاو قاوەکانی تردا تاڵتربوو. کازوو گەڕایەوە، لە چێشتخانەکە کتری قاوەکەی بە دەستەوە بوو، پاشان قاوەی بۆ فوساجی تێکرد.

فوساجی بە ئاسایی خوێندنەوەی ڕۆژنامەکەی تەواو کرد، لەو کاتەی کازوو قاوەکەی بۆ تازە دەکردەوە، بەڵام ئەمڕۆ بەو جۆرە نەبوو، بەڵکو ڕاستەوخۆ تەماشای دەستی کازووی دەکرد.

کازوو هەستێکی سەیری هەبوو، لەوکاتەدا پێی وابوو کە فوساجی شتێکی تری دەوێت جگە لە تازەکردنەوەی قاوەکە؛ "ئایا شتێکی ترت پێویستە؟"

به زەردەخەنەیەکەوە گوتی: "تۆ کارمەندی تازەیت؟"

کەمێک تێڕاما، دواتر گوتی: "هممم..."

"ئۆو بەڕاستی".

فوساجی بە هەستی شەرمەوە سەری داخستوو، بەردەوام بوو لە خوێندنەوەی گۆڤارەکە.

کازوو بەردەوام بوو لە کارکردن بەبێ هەستانە، کازوو وەکو ڕۆبۆتێک دەردەکەوت لە قاوەخانەکەدا، هەموو ئەوەی دەیکرد تەنها خاوێن کردنەوەی مێزەکان و تازەکردنەوەی قاوە و ئامادەکردنی خواردن بوو بۆ کڕیارەکان، بەبێ ئەوەی تێکەڵی کاری ئەوانی تر ببێت.

پرسیاری لە فوساجی کرد؛ "زوو زوو دێیت بۆ ئێرە؟"

"بەڵێ."

"ئایا هیچت بیستووە دەربارەی ئەم شوێنە؟ واتە بابەتی ئەفسانە کۆنەکە."

"بەڵێ زۆرم بیستووە."

"دەربارەی ئەو کورسییە؟"

"بەڵێ."

"کەواتە تۆ یەکێکیت لەو کەسانەی کە دەیانەوێت گەشتی کات ئەنجام بدەن."

"بەڵێ".

"ئەگەر بگەڕێیتەوە ڕابردوو چی دەکەیت؟"

ئەوە کارێک نەبوو لەو کارە ئاساییانەی کە کازوو دەیکرد، چونکە تێکەڵی ئەوانی تر نەدەبوو، بۆیە هەر زوو گوتی؛ "ئۆو پرسیارەکەم زۆر نابەجێ بوو ببورە."

جانتاکەی کردەوە زەرفێکی نامەی دەرهێنا، کە قەراغەکانی نوشتابوونەوە، وا پێدەچوو ماوەیەکی زۆر بێت هەڵیگرتبێت.

کازوو؛ "ئەوە چییە؟"

"بۆ ژنەکەمە".

"ئەوە نامەیە؟"

"بەڵێ".

"بۆ ژنەکەت؟"

"بەڵێ، هەرگیز نەمتوانیووە پێی بدەم."

"کەواتە دەتەوێت بگەڕێیتەوە ئەو ڕۆژەی کە دەبوو ئەو نامەیەی پێ بدەیت؟"

"بەڵێ، بەو شێوەیە".

"ئێستا ژنەکەت لە کوێیە؟"

هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و بۆ ساتێک بێدەنگ بوو، پاشان؛ "هممم ..."

"نازانم".

پاشان بە بێ ئومێدییەوە سەری داخستەوە.

کازووش هیچ شتێکی تری نەگوت دەربارەی بابەتەکە.

"بەڵام بەڕاستی من هاوسەرێکم هەبوو ...هممم.... ناوی .... ناویم بیر ناکەوێتەوە".

لەو کاتەدا کی لە ژوورەکەی دواوە گەڕایەوە، ڕەنگ لە ڕووی پەڕیبوو، پێدەچوو بەهۆی بیستنی ئەو گفتوگۆیەوە بێت کە لە نێوان کازوو و فوساجیدا ڕوویداوە.

"بەڕاستی ئەوە نادادپەروەرییە."

کازوو هەوڵی دەدا بە کەمترین وشە بابەتەکە بچوک بکاتەوە؛ "دەربارەی ئەو بابەتە خۆت دڵتەنگ مەکە."

**تەق-تەق**

کازوو بە بێدەنگی تەماشای دەرگاکەی دەکرد، لەو کاتەدا کۆهتاکی لە دەرگاکەوە هاتە ژوورەوە.

کۆهتاکی کاری پەرستاری دەکرد لە یەکێک لە نەخۆشخانەکانی شاردا، بەڵام ڕۆژانە دەهاتە قاوەخانەکە لەجیاتی ئەوەی بچێتەوە ماڵەوە ڕاستەوخۆ، تیشێرتێکی سەوزی زەیتوونی لەبەردابوو لەگەڵ پانتۆڵێکی سێ چارەکی شین و جانتایەکی ڕەش لە شانی بوو، بە دەسڕەکەی ئارەقەکەی نێوچەوانی سڕی بەرلەوەی بچێتە لای فوساجی سەرەتا کەمێک لای کی و کازوو وەستا.

دواتر؛ "سڵاو، فوساجی دووبارە ئەمڕۆش لێرەیت."

بە شڵەژاوی سەری بەرزکردەوە، تەماشای کۆهتاکی کرد و دواتر دووبارە سەری داخستەوە بەردەوام بوو لە گۆڤار خوێندنەوە.

کۆهتاکی هەستی بەوە کرد کە ئەم کاردانەوەیەی فوساجی ئاسایی نییە، لێی نزیک بۆوە و گوتی؛ "فوساجی تۆ باشیت؟"

فوساجی سەری هەڵبڕی و گوتی؛ "ببورە ئێمە یەکتر دەناسین؟"

کۆهتاکی بە نائومێدانە ڕاستەوخۆ خەندەی سەر ڕوخساری گۆڕا، فوساجی تووشی زەهایمەر بوو بوو، کە تەواوی یادەوەری لەدەست دا بوو. بەجۆرێک یادەوەرییە کۆنەکانی لە دەست دەدا و ئەوانەی ئێستاشی بیر دەچووەوە، بە ئەستەمیش ئەوانەی ئێستای بیردەهاتەوە کە ڕوویدەدا. تەنانەت وای

لێهاتبوو کەسایەتی خۆشی نەدەناسییەوە.

لەو ساتەدا، فوساجی بیری کەوتەوە کە هاوسەری هەیە، بەڵام نەیدەزانی هاوسەرەکەی کۆهتاکییە کە بەرانبەری وەستاوە.

"پێم وابێت نا."

یەک دوو هەنگاو کۆهتاکی چووە دواوە.

کۆهتاکی لەسەر کورسی بەردەم مێزی ژمێریارەکە دانیشت، کە بە تەواوی لە فوساجییەوە دووربوو. دوای ئەوەی دانیشت دەسرەکە لە دەستی کەوتە خوارەوە، بەڵام وا ڕەفتاری کرد کە هی ئەو نەبێت. بەڵام فوساجی تێبینی کرد و بۆی هەڵگرتەوە، دواتر چووە لای مێزی ژمێریارەکە، ئەو جێیەی کە کۆهتاکی لێی دانیشتبوو.

"دەبێت بمبوریت لەم ڕۆژانەدا من شتی زیاتر لە یاد دەکەم".

کۆهتاکی بەبێ ئەوەی تەماشاشی بکات؛ "باشە."

پاشان دەسرەکەی لە دەست وەرگرتەوە.

دواتر سەری داخست و گەڕایەوە سەرمێزەکەی، بەردەوام بوو لە هەڵدانەوەی پەڕەکان، پاشان قومێکی لە قاوەکە دا و گوتی؛ "بە نەفرەت بیت سارد بوەتەوە." لە کاتێکدا پێش کەمێک دەبوو قاوەکەیان بۆ هێنابوو.

کازوو گوتی؛ "بۆت تازە بکەمەوە؟"

فوساجی هەستایەوە لە جێیەکەی و گوتی؛ "من دەبێت بڕۆم."

پاشان کەلوپەلەکانی کۆکردەوە، لەو کاتەدا کۆهتاکی بە نائومێدانە تەماشای دەکرد.

فوساجی بەرەو لای کاشێرەکە هاتوو گوتی؛ "چەندی کرد؟"

"سێ سەد و هەشتا یەن."

"فەرموو ئەوە هەزار یەنە"

هەزار یەنی لەسەر مێزەکە دانا.

"هەزار یەنم وەرگرت."

پاشان کردییە ناو ئامێرەکە.

فوساجی بە لاچاو تەماشای کۆهتاکی دەکرد بەبێ ئەوەی هیچ قسەیەک بکات و لەهەمان کاتدا چاوەڕێی وەرگرتنی پارە ماوەکە بوو.

"شەش سەد و بیست یەن باقی".

فوساجی بە پەلە پارەکەی خستەوە ناو جزدانەکەی و گوتی؛ "سوپاس بۆ قاوەکە"

پاشان لە قاوەخانەکە چووە دەرەوە.

**تەق-تەق**

"سوپاس بۆتۆش دووبارە سەردانمان بکە..."

دوای ئەوەی فوساجی چووە دەرەوە لە قاوەخانەکە، دەنگی هیچ شتێکی تر نەدەبیسترا، تەنانەت میوزیکیش کاری نەدەکرد، هەموو ئەو دەنگەی دەبیسترا دەنگی چرکەی کاتژمێرەکان و هەڵدانەوەی پەڕەی خاتوونە کراس سپییەکە بوو. هەر لەو

کاتەدا کازوو بێدەنگییەکەی شکاند و گوتی: "کۆهتاکی ..." پێش ئەوەی قسەکەی تەواو بکات کۆهتاکی وەڵامی دایەوە: "کێشە نییە، من لەڕووی دەروونییەوە خۆم ئامادەکردبوو بۆ ئەمڕۆ."

کی و کازوو پێکەوە لە هەمان کاتدا: "خەم مەخۆ".

دووبارە سەری داخستەوە، کۆهتاکی بە تەواوی بێهیوا بووبوو لە بابەتەکە، چونکە دەیزانی بەرەبەرە فوساجی کۆهتاکی لەبیرنامێنێت و لەوەش زیاتر کۆهتاکی وەکو پەرستارێک گرنگی پێدەدا، تەنها کی و کازوو و ناگاری و هیرای دەربارەی نەخۆشییەکەی فوساجییەوە دەیانزانی.

جۆری زەهایمەرەکەی فوساجی بەوجۆرەبوو کە بەرەبەرە هەموو شتەکانی لەبیردەچوەوە و لە پڕدا تووشی ئەو بارودۆخە بووبوو، ئەمەش وای کرد بوو کە کۆهتاکی بکەوێتە شۆکەوە، لەو کاتەدا کۆهتاکی لە دڵتەنگیدا بەرەو چێشتخانەکە ڕۆیشت.

کی لە چێشتخانەکە هاتە دەرەوە بوتڵێکی شوشەی بەدەستەوە بوو. گوتی: "دیاری یەکێک لە میوانەکانە." پاشان لەسەر مێزەکە داینا: "کەس دەیەوێت بخواتەوە؟"

ئەو خواردنەوەیەی بەدەستی کییەوە بوو ناوی حەوت دڵخۆشییەکە بوو، کی چاوەکانی سووربووبوونەوە لە گریاندا، کەشوهەوای نێوان هەرسێ ئافرەتەکە دڵتەنگی و خەمناک بوو بەهۆی بارودۆخی کۆهتاکییەوە.

کۆهتاکی دوودڵ بوو لەوەی بخواتەوە یاخود نا، لەکۆتایدا گوتی: "باشە، تەنها پەرداخێک..."

هیرای هەمیشە کۆهتاکی بە خاتوونە بەهیواکە ناوزەند دەکرد، چونکە چەند خولەکێک بەرلەوە دڵتەنگی دایگرتبوو، بەڵام ئێستا بارودۆخی ئاسایی بوەتەوە و داوای خواردنەوە دەکات. کازوو گوتی؛ "من تەماشا دەکەم بزانم شتێکمان هەیە لەگەڵی بخۆین."

"بۆچی خواردنەوەکە گەرم نەکەینەوە؟"

"نا، بەمجۆرە باشە."

"باشە، کەواتە هەروا دەیخۆینەوە."

کی سەری بوتڵەکەی کردەوە، پاشان پەرداخەکانی پڕکرد.

کۆهتاکی دوای وەرگرتنی خواردنەوەکە؛ "سوپاس".

کازو کەمێک خەیارشۆری لەسەر مێزەکە دانا؛ "فەرموو هەر ئەمەم پەیداکرد."

پاشان کردییە ناو قاپەکەی بەردەمیانەوە.

کی؛ "ئۆو زۆر بەتامە، بەڵام من ناتوانم زۆر بخۆمەوە."

پاشان لەناو بەفرگرەکە شەربەتی پرتەقاڵی دەرهێنا و کردییە ناو پەرداخەکەوە.

هیچ کام لە خانمەکان هەمان بیرکردنەوەیان نەبوو بۆ خواردنەوەکە. خواردنەوەکە لەبەر ئەوەی ناوی حەوت دڵخۆشییەکە بوو دەگوترا حەوت جۆری دڵخۆشی جیاوازت پێدەبەخشێت، کە دەتخواردەوە هەستت بە دەنکۆڵەی وردی زبر دەکرد لەسەر زمانت، پاشان بۆنێکی میوەی تازەی دەدا، کە خواردنەوەکە لە گەدەت دەچووە خوارەوە هەستی ئارامی بە تەواوی لەشتدا بڵاو دەبوەیەوە.

دوای ئەوەی کۆهتاکی بۆنی خواردنەوەکە هات بە لووتیدا، یادەوەریی خۆی بیرکەوتەوە پێش پانزە ساڵ کە چۆن بۆ یەکەمین جار سەردانی قاوەخانەکەی کردووە.

ئەو ڕۆژەی کە بۆ یەکەمین جار سەردانی قاوەخانەکەی کردبوو ئەو ڕۆژەبوو کە حکومەتی ژاپۆنی بەهۆی بەرزبوونەوەی پلەکانی گەرماوە ڕاگرتنی دەوامی ڕاگەیاندبوو، بەو هۆیەشەوە فوساجی و کۆهتاکی چووبوون سەردانی بازاڕ بکەن، دواتر لەبەر گەرماکە بڕیاریان دابوو سەردانی قاوەخانەیەک بکەن و کەمێک پشوو بدەن. بەڵام کێشەکە ئەوە بوو بەو ئێوارەیە تەواوی قاوەخانە و ڕێستۆرانتە خێزانییەکان جێگای بەتاڵیان نەمابوو.

لە شانسی ئەواندا لە خوارەوەی شەقامەکە تەنها قاوەخانەیەک کە کرابێتەوە ئەم قاوەخانەیە بوو کە ناوەکەی هەمان ناوی ئەو گۆرانییەی هەبوو کە کۆهتاکی زۆر ئارەزووی لێبوو؛ (بەرز و نزم).

گۆرانییەکە باسی ئەوەی دەکرد کەسێک لە پێناو خۆشەویستییەکەیدا بەسەر دەریایەکی گڕکانیدا دەڕوات. دوای ئەوەی لە دەرگای قاوەخانەکە چوونە ژوورەوە تێبینی ئەوەیان کرد سێ مێز بەتاڵە و تەنها خاتوونێکی کراس سپی دانیشتووە لە یەکێکیاندا، زۆر خۆشحاڵ بوون، چونکە لە کۆتایدا جێیەکیان دەستکەوت تاکو دابنیشن.

لە مێزی نزیک دەرگاکە دانیشتن، دوای ئەوەی دووبارە گارسۆنەکە هات داواکارییەکانیان وەربگرێت کە چەند خولەکێک لەوەوبەر هاتبوو ئاوی ساردی بۆ هێنابوون، ڕاستەخۆ فوساجی داوای قاوەی ساردی کرد و کۆهتاکیش کە لەبەرانبەریدا دانیشتبوو هەمان شتی داواکردەوە. فوساجی هەستی بە ئارامی نەدەکرد لەو جێیەدا، هەربۆیە هەستا و چووە کورسی بەردەم مێزی ژمێریارەکە دانیشت، بەڵام ئەم ڕەفتارەی بەهیچ شێوەیەک کۆهتاکی دڵتەنگ نەکرد. ئەوەی لەوکاتەدا کۆهتاکی بیری لێدەکردەوە ئەوەبوو چەندە مایەی دڵخۆشییە قاوەخانەیەکی دۆزیوەتەوە نزیک ئەو نەخۆشخانەیەیە کە کاری لێدەکات.

کۆهتاکی بە وردی سەرنجی دیواری قاوەخانەکەی دەدا کە لە دارێکی قاوە دروست کرابوو، پاشان بنمیچەکە چۆن دەدرەوشایەوە، ئەوەی سەیربوو هیچ پەنجەرەیەکی تێدا نەبوو، قاوەخانەکە تەنها سێ کاتژمێری کۆن بەدیوارەکەوە هەڵواسرابوو، هەرچەندی کۆهتاکی زۆری دەربارەی شتە ئەنتیکەکان نەدەزانی، بەڵام درکی بەوە کرد کە ئەو کاتژمێرانەش یەکێکن لەو شتانە.

لەگەڵ ئەوەی هیچ پەنجەرەیەک لە قاوەخانەکەدا نەبوو، هیچ هۆکارێکی فێنککەرەوەش بوونی نەبوو، بەڵام کۆهتاکی هەستی بەوە دەکرد کە قاوەخانەکە چەندە فێنکە، تەنانەت پرسیاری لە ناگاری و کی کرد دەربارەی، گوتیان هەر لەمێژە وەها بووە.

ئەوەی سەیربوو قاوەخانەکە تەنها پانکەیەکی تێدابوو کە بە بنمیچەکەوە هەڵواسرابوو، بەڵام بەشی پێویست فێنکیی بەخشیبوو بە تەواوی قاوەخانەکە، کۆهتاکی لە دوای ئەو ڕۆژەوە بەردەوام سەردنی دەکرد هەر کاتێک پشووی هەبووایە، یاخود لە نەخۆشخانە بگەڕایەتەوە هەرچەندە چەندین جار پرسیاری دەربارەی فێنکی قاوەخانەکەی لە ناگاری و کی کردبوو، بەڵام پێیان دەگووت کە لەمێژە بەمجۆرەیە.

کازوو پەرداخەکەی بەرز کردەوە؛ "بەخۆشیتان". بەڵام دواتر هەستی بە شەرمەزاری کرد و گوتی؛ "پێم وابێت ئاهەنگ گێڕان نییە وایە؟"

کی قۆڵی کۆهتاکی ڕاکێشا و گوتی؛ "وەرە هێندە خۆت خەمبار مەکە تکایە."

کازوو؛ "داوای لێبوردنم هەیە."

کۆهتاکی؛ "نەخێر، کێشەیەک نییە."

کۆهتاکی پەرداخێکی وەرگرت و ئەویش خواردییەوە، پاشان گوتی؛ "ماوەی ساڵێک دەبێت کە بە ناوی خۆمەوە بانگی نەکردووم و نامناسێتەوە... ئەو بەتەواوی ئەو یادەوەرییەی لە دەست داوە کە دەربارەی منە... من بە تەواوی خۆم بۆ ئەم بابەتە ئامادەکردبوو."

دووبارە چاوەکانی کی سوور هەڵگەڕا.

کۆهتاکی؛ "بەڵام کێشە نییە..." هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی و بەردەوام بوو؛ "هاوڕێیان هەرچۆنێک بێت من پەرستارم، بە

واتایەکی تر ئەگەر وەکو هاوسەرێک ئەو منی بیر نەکەوێتەوە دەتوانم وەک پەرسیارێک لە ژیانیدا بمێنمەوە و چاودێری بکەم."

کۆهتاکی هێزی دایەبەر خۆی و هەستایەوە؛ "سەیربکەن هاورێیان، من پەرستارم، تەنانەت ئەگەر بەتەواوی لە یادەوەری ئەودا بسڕێمەوە ئەوا هێشتا من وەکو پەرستارێک خزمەتی دەکەم."

کۆهتاکی هەوڵی دەدا تەواوی بڕوابەخۆبوونی لە دەنگیدا پیشان بدات بەرانبەر کی و کازوو، هەرچەندە ڕاستی بابەتەکەش وەها بوو ئەو وەکو پەرستارێک لای هاوسەرەکەی مابووەوە، وەکو خۆی دەیگوت من دەتوانم لای بمێنمەوە وەکو پەرستارێک.

کازوو بەبێ هەستانە یاری بە پەرداخەکەی دەکرد و خەیاڵی ڕۆیشتبوو، کیش لەوکاتەدا دڵۆپە فرمێسکێک لە چاوی کەوتە خوارەوە.

شلَپ.

بێدەنگی تەواوی قاوەخانەکەی دەگرتبوو، بەڵام لەپڕدا تاکە دەنگ کە بیسترا دەنگی داخستنی پەرتووکەکەی خاتوونە جل سپییەکە بوو.

کۆهتاکی لەو کاتەدا ئاوڕی دایەوە، ئەوە یەکەمین جار بوو تێبینی ئەوە بکات خاتوونەکە ڕۆمانەکەی دادەخات و پاشان دەستە سڕەکەی لە جانتا سپییەکەی دەرهێنا و هەستایە

سەرپێ تاکو بەرەو دەستشۆرەکە ڕۆیشت.

هەرکام لە کازوو و کی سەرنجی ئەوەیان نەدا کە خاتوونەکە لە جێیەکەی هەستاوە، کی چاوی لەسەر کۆهتاکی لانەدەبرد. کازووش قومێکی تری لە خواردنەوەکەی خواردەوە.

کۆهتاکی گوتی: "بەڕاستی پێم سەیرە بۆچی فوساجی دەیەوێت بگەڕێتەوە ڕابردوو؟" تەواوی سەرنجی کۆهتاکی لەوکاتەدا تەنها لەسەر کورسی خاتوونە کراس سپییەکە بوو، هێندەی دەزانی دەربارەی کورسییەکە کە دەتگەڕێنێتەوە ڕابردوو.

فوساجی پێش ئەوەی تووشی نەخۆشی زەهایمەر بێت باوەڕی بەوە نەبوو کە کورسییەکی لەو جۆرە هەیە دەتگەڕێنێتەوە ڕابردوو، لەوەش زیاتر ئەو ژنە تارماییە یاخود شتێکی لەو بابەتە.

دوای ئەوەی فوساجی بەرەبەرە یادەوەری لەدەستدەدا هەموو ڕۆژ دەهات بۆ قاوەخانەکە بە ئومێدی ئەوەی خاتوونە کراس سپییەکە لە جێیەکەی هەستێت و دابنیشێت، لەو کاتەوە کۆهتاکی توشی سەرسوڕمان بووە دەربارەی ڕووداوەکە: بۆچی دەیەوێت بگەڕێتەوە ڕابردوو؟

تەنانەت زۆربەی کات کۆهتاکی پرسیاری ئەوەی لە فوساجی کردووە، بەڵام هەموو وەڵامەکەی ئەوە بووە کە "نهێنییە."

کازوو: "لەبەر ئەوەیە دەیەوێت نامەیەکت پێبدات."

"بیدات بە من؟"

"هممم."

"نامە؟"

"فوساجی گوتی کە ئەوە شتێکە کە نەیتوانیووە ئەنجامی بدات."

کۆهتاکی کەمێک بیری کردەوە و گوتی؛ "پێم وابێت کە..."

کۆهتاکی بۆ ساتێک هەستی بە حەوانەوە کرد، چونکە لە کۆتایدا هەواڵێکی باشی بیست.

بەڵام وەکو کاردانەوە هیچ کاردانەوەیەکی ئەوتۆی نەبوو، چونکە پێی وانەبوو فوساجی بابەتێکی گرنگی لە نامەکەدا نوسیبێت بۆی، لەبەرئەوەی فوساجی باش نەبوو لە نوسین و خوێندنەوەدا.

***

چونکە فوساجی لە شارێکی بچووکدا گەورە بوو بوو، خێزانەکەی پشتیان بە ڕاوکردنی دەریایی دەبەست، هەر لەبەر ئەوەش بوو دەبوو هەموو ئەندامەکانی خێزانەکە کاربکەن، فوساجی لەبەر پەستانی کارکردن بەباشی نەیدەتوانی وانەکانی بخوێنێت، ئەمەش وای کردبوو بەباشی پیتەکان نەناسێتەوە.

کۆهتاکی و فوساجی لە ڕێگەی ناسیاوێکەوە یەکتریان ناسیبوو، کۆهتاکی ئەو کاتە لە کۆلێژی پەرستاری دەیخوێند، ئەو کات کە یەکیان ناسی تەمەنی فوساجی تەنها بیست و شەش ساڵ بوو، تەمەنی کۆهتاکیش بیست و یەک ساڵان بوو، ئەوان

بە نامە قسەیان دەکرد، چونکە سەردەمی خۆشەویستی ئەوان پێش پەیدابوونی تەلەفۆن بوو. کۆهتاکی هەمیشە لە نامەکانیدا بە دوورو درێژی باسی شێوازی بەسەر بردنی ڕۆژەکەی و حەزی لە چییە ڕقی لە چییە و ئەمڕۆی کۆلێژی چۆن بەسەر بردووە و خەونەکانی داهاتووی چین و دەیەوێت بەچی بگات، تەواوی ئەمانەی لەناو نامەکاندا بۆ فوساجی دەنوسی، بەمەش هەر نامەیەکی نزیکی دە لاپەڕە دەبوو، بەڵام هەموو ئەوەی فوساجی لە وەڵامدا بۆی دەنووسی لە دێڕێک زیاتر تێپەڕی نەدەکرد کە بەم جۆرە بوو؛

"سوپاس بۆ ئەو نامە جوانەی کە نوسیووتە، زۆر خۆشحاڵ بووم."

سەرەتا کۆهتاکی بابەتەکەی بە ئاسایی وەرگرتبوو، چونکە پێی وابوو بەهۆی سەرقاڵییەوە لە کارەکەی نامەکان وەها کورتن، بەڵام دواترهەستی بە بێزاری دەکرد، ئەو هەموو هەستە دەرببڕێت و هەموو وەڵامەکە ئەوەندە بێت، هەر بۆیە پێی گوت کە ئایا دەیەوێت جیاببنەوە یاخود نا، جیا لەوەش زۆر زۆر بەدرەنگی وەڵامی دەدایەوە، فوساجی جار هەبوو دوو مانگی پێدەچوو تاکو وەڵامێکی دەدایەوە.

بەڵام شتێکی پێشبینی نەکراو ڕوویدا لە کۆتا جاردا، فوساجی نوسیبووی؛ "هاوسەرگیریم لەگەڵ دەکەیت؟"

ئەمە کاریگەرترین کورتە دێڕ بوو کە کۆهتاکی خۆی بۆ ئامادە نەکرد بوو، سەرەتا شۆک بوو، بەڵام دواتر بە

پەرۆشییەوە وەڵامی دایەوە؛ "بەڵێ، ڕازیم."

دوا بــەدوای ئـەو ڕووداوە کۆهتاکی بــەوەی زانـی کە فوساجی ئـەو هەموو ماوەیە لەبەر ئـەوە نامەکانی درەنگ دەکـەوت و وەڵامەکانی بەو جۆرە بوون چونکە نازانێت بە باشی بخوێنێتەوە و بنوسێت، جیا لـەوەش ئەو کاتانەی کە کۆهتاکی ئەو هەموو نامەیەی بۆ دەنوسی دەبـوو فوساجی بیباتە لای چەند کەسێکی جیاواز تاکو بۆی بخوێننەوە، پاشان وەڵامی دەدایـەوە و بە ئەستەم دەیتوانی وشەکان ببەستێت بەیەکەوە.

کـازوو بە دەستەکانی هەوڵیدا ڕوونکردنەوەی بۆ بدات؛ "زەرفێکی قاوەیی پێبوو بەم جۆرە."

کۆهتاکی؛ "زەرفی قاوەیی؟"

بەکارهێنانی زەرفی قاوەیی لای ئـەوان مانای نامەیەکی خۆشەویستی یاخود نامەیەکی گرنگ بوو.

کی؛ "ڕەنگە نامەیەکی خۆشەویستی بێت."

کۆهتاکی؛ "نا بابەتەکە بەو جۆرە نییە."

کازوو؛ "ئەی ئەگەر نامەی خۆشەویستی بوو کاردانەوەت چی دەبێت؟"

هەرچەندە ئەوە خووی کازوو نەبوو کە پرسیار دەربارەی شتە تایبەتییەکانی ئەوانی تـرەوە بکات، بەڵام لەبەر ئەوەی بابەتەکە دەربارەی خۆشەویستی و ڕزگارکردنی ژیانی کەسێک بوو بۆیە پرسیاری کرد.

کۆهتاکی؛ "بێگومان بە پەرۆش دەبووم بۆ خوێندەوەی."

ئەو قسەیەی درۆ نەبوو، چونکە بێگومان ئەگەر نامەیەکی لەو جۆرەی بۆ بهاتایە دڵخۆش دەبوو بەخوێندنەوەی.

کی؛ "ئەی بۆ ناگەڕێیتەوە بۆ ڕابردوو؟"

کۆهتاکی؛ "چی؟"

کازوو چاوی بزکردەوە؛ "خوشکێ تۆ بەڕاستتە؟"

کی بە شێوازی جەختکردنەوە گوتی؛ "ئەو دەبێت نامەکە بخوێنێتەوە."

کۆهتاکی؛ "خۆشەویستم خۆت بگرە وا هاتم."

هەرچەندی کات درەنگ بووبوو بۆ پەشیمانکردنەوەی.

کی؛ "ئەگەر فوساجی نامەی خۆشەویستی بۆ نوسیبێت کەواتە دەبێت بیخوێنێتەوە."

هەرچەندە کی دڵنیا نەبوو لە قسەکەی، بەڵام لەبەر ئەوەی بابەتەکەی لای کۆهتاکی وروژاندبوو بۆیە ئامادە بوو بۆ جەختکردنەوە.

کازوو هەستی بە نائارامی دەکرد لەو گفتوگۆیەدا، کۆهتاکی تەواوی پڕوپاگەندە و یاساکانی بیستبوو دەربارەی کورسییەکە، هەر بۆیە چاوی لەسەر کورسییەکە بوو، بەڵام ئەگەر تەنانەت هەموو ئەو شتانەی لە ڕابردووی بزانیایە هێشتا فوساجی لە نەخۆشییەکەی چاک نەدەبووەوە. بەڵام ئەگەر هەر بەڕاستی وەکو کازوو گوتی فوساجی بیەوێت ئەو نامەیە بدات بە کۆهتاکی و بیخوێنێتەوە کەواتە بۆ نەگەڕێتەوە ڕابردوو،

کۆهتاکی بەم جۆرە بیری دەکردەوە، لە لایەکی تریشەوە ئەگەر بگەڕێتەوە چیتر لە بارودۆخی چاوەڕوانی نابێت تاکو فوساجی نامەکەی پێبدات. کۆهتاکی گوتی؛ "ئەگەر هەر بەڕاستی نامەی خۆشەویستی بۆم نوسیبێت؟"

وشـەی خۆشـەویستی هێزێکی زیـاتـری بـە کۆهتاکی بەخشیبوو، کی سەری ڕازیبوونی لەقاند، لەو کاتەدا کازوو چیتر ئارامی نەما، پەرداخەکەی دانا لەسەر مێزەکە و چووە چێشتخانەکە.

کۆهتاکی لەبەردەم ئەو کورسییە وەستابوو کە دەیگواستەوە بۆ ڕابـردوو، دڵـی بەخێرایی لێیدەدا، مستی توند کردبوو، کورسییەکەی ڕاکێشا و ویستی دابنیشێت، جۆری کورسییەکان کۆن بوون، لەدار دروست کرابوون، جێی پاڵدانەوەکەی نەخشی تێدا دروست کرابوو، قاچەکانیشی لەخوارەوە چەمابوونەوە، پاشان جێی دانیشتنەکەی بە قوماشی سەوز ڕووپۆشکرابوو، کە تەماشای دیمەنی قاوەخانەکەت دەکرد هەستت دەکرد لـە سـەردەمـی نـوێدا دروسـت کـراوە و بـە بابەتی ئەنتیکە ڕازێنراوەتەوە.

پاشان تەماشای لای چێشتخانەکەی کرد، ئاخۆ دەبێت چەندە بەباشی شوێنەکە گرنگی پێبدرێت و خاوێن بکرێتەوە. کە ئەو کارەش تەنها کازوو و کی لە ئەستۆیان گرتووە، کازوو بەرەو لای هات، سینییەکی پێبوو کە کترییەکی ڕەساسی و کوپێکی سپی قاوەیی لەسەربوو.

تا کازوو زیاتر نزیک دەبووەوە لێدانەکانی دڵی کۆهتاکی زیاتر دەبوو.

کازوو وەک پرسیاری هەمیشەیی گوتی: "یاساکان دەزانیت وایە؟"

کۆهتاکی پرسیارەکانی لەمێشکی خۆیدا تاوتوێ کرد، یاسای یەکەم ئەوە بوو تەنها دەتوانیت ئەو کەسانە ببینیتەوە کە پێشتر سەردانی ئەم قاوەخانەیەیان کردبێت.

کۆهتاکی: ئەمەیان کێشە نییە، چونکە پێشتر لەگەڵ فوساجی سەردانی قاوەخانەکەمان کردووە.

دووەم یاسا ئەوەبوو ئێستا بە هیچ جۆرێک ناگۆڕێت، هەرچەندە بگەڕێیتەوە و ڕابردوو بە دڵی خۆت بگۆڕیت. کۆهتاکی ئەم یاسایەشی بەلاوە ئاسایی بوو. چونکە تەنانەت ئەگەر بگەڕێتەوە ڕابردوو چارەسەری زەهایمەر دۆزرابێتەوە و فوساجی بیخوات هێشتا ئەو ڕاستییەی ئێستا ناگۆڕێت کە فوساجی تووشی زەهایمەربووە.

سێیەم یاسا ئەوەبوو کە دەبێت چاوەڕوان بێت تاکو خاتوونە کراس سپییەکە دەچێت بۆ دەستشۆرەکە، ئەم یاسایەش جێبەجێبوو بوو خودکارانە، چونکە لەو ساتەدا ژنەکە چووبوو. هەرچەندە ئەوەشی بیستبوو ئەگەر تۆ هەوڵبدەیت بە زۆر ژنەکە لەسەر کورسییەکە هەستێنیت ئەوا جادووت لێدەکات.

یاسای چوارەم دەیگوت بە گەڕانەوەت بۆ ڕابردوو نابێت لەسەر ئەو کورسییە هەستیتەوە، تەنها دەبێت لەوێدا دابنیشیت

تا کۆتایی کارەکە، لەبەر ئەوەی لەناو قاوەخانەکەدا هیچ تەلەفۆنێکی تێدا نەبوو، بۆیە بە ئەستەم هێڵەکانی پەیوەندی کردن وەردەگیران و دەتتوانی پەیوەندی بکەیت.

کۆهتاکی لە ڕابردوودا ئەوەی بیستبوو کە قاوەخانەکە بەوە ناوبانگی دەرکردووە خەڵک دەگەڕێتەوە ڕابردوو، بەڵام هیچ سەرسام نەبوو لەوەی؛ خەڵک لەو کارە دەکشێنەوە بەهۆی یاسا بێماناکانەوە.

کۆهتاکی بیری کەوتەوە کە لەو کاتەوە خەیاڵی ڕۆیشتووە کازوو چاوەڕێی وەڵامەکەیەتی؛ "دەبێت قاوەکە بخۆمەوە بەرلەوەی سارد ببێتەوە؟"

"بەڵێ."

"هیچ شتێکی تر هەیە؟"

بەڵام شتێکی تر هەبوو کە دەیویست بیزانێت دەربارەی یاساکان؛ چۆن ڕاستەوخۆ دەگەڕێتەوە هەمان بەروار و کاتژمێر؟

کازوو؛ "دەبێت وێنای ئەو ڕۆژە بکەیت کە دەتەوێت بۆی بگەڕێیتەوە."

"وێناکردن؟"

"ڕۆژێک پێش ئەوەی فوساجی تۆ لەبیر بکات، ئەو ڕۆژەی کە دەیویست نامەکەت پێ بدات... ئەو ڕۆژەی کە نامەکەی پێبوو لە قاوەخانەکە."

ئەو ڕۆژەی هێشتا کۆهتاکی بیربوو. بیرهاتنەوەی ئەو ڕۆژە زۆرقورس بوو، بەڵام دەیزانی بە نزیکەی سێ ساڵ بەر لە ئێستا دەبوو، ئەو کاتەبوو پێش ئەوەی فوساجی هیچ نیشانەیەکی نەخۆشییەکەی تێدا بەدیبکرێت.

ئەو ڕۆژەی کە بەلایەوە قورس بوو نامەکە بدات بە کۆهتاکی. کەمێک قورس بوو بۆ کۆهتاکی بیرلەو ڕۆژە بکاتەوە، بەرلەوەی فوساجی نامەکەی بۆ نوسیبێت بۆیە بیری لەوە دەکردەوە کە فوساجی دەیەوێت نامەکەی پێبدات.

هەر بۆیە بیری لەو ڕۆژە کردەوە کە فوساجی سەردانی قاوەخانەکەی کردووە و نامەکەی پێیە، بە جوانی کردوویەتییە ناو جانتاکەیەوە و خۆی بۆ ئەوە ئامادەکردووە تاکو بیدات بە کۆهتاکی.

بە تەواوی نەیدەزانی لە چ ڕۆژێکدا نامەکەی دەداتێ، بەڵام وەهای بیرکردەوە ئەو ڕۆژەی جانتاکەی پێبێت بێگومان پلانی بۆ ئەوە داناوە تاکو بیداتێ.

کازوو پرسی؛ "تۆ ئامادەیت؟"

"خولەکێک بوەستە".

دوای ئەوەی هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی، کازوو قسەکەی تەواو کرد؛ "ئەو ڕۆژەی کە نامەکەی پێیە... ئەو ڕۆژەی دەیەوێت پێت بدات."

تەواو بەسە ڕاڕایی، تەنها سەرنج بدە. (کۆهتاکی لە دڵی خۆیدا).

ئەمجارە ڕاستەوخۆ تەماشای چاوەکانی کازووی کرد و گوتی؛ "من ئامادەم."

کازوو بە زەردەخەنەیەکی ساردەوە کوپە بەتاڵەکەی لەبەردەم کۆهتاکی دانا و پاشان کترییە گەرمە زیویەکەی بەدەستەوە گرتبوو، پێش ئەوەی قاوەکە ئامادە بکات گوتی؛ "لەبیرت بێت..." کۆهتاکی ڕەنگی سپی هەڵگەڕا؛ "قاوەکە بخۆرەوە بەرلەوەی ساردببێتەوە."

وردە وردە هەڵمی گەرمی قاوەکە بەرز دەبووەوە، دواتر کازوو سەرقاڵی ئامادەکردن و پاڵاوترنی قاوەکە بوو، کۆهتاکی سەرنجی کترییەکەی دەدا، زۆر جیاوازتربوو لەوانەی پێشتر ئەو بینیبووی، کەمێک لەوانە بچوکتر بوو کە بۆ میوانەکان دادەنرا، تەنانەت ڕەنگی قاوەکە لەوە تۆختر بوو کە پێشکەشی میوانەکانی دەکرد.

بەرەبەرە شتەکان لەبەرچاو کۆهتاکی گۆڕا و لێڵبوو، هەستی بوە دەکرد کاریگەری خواردنەوەکەی پێشترە لەسەری و سەرخۆش بووە. بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەبوو پەیوەندی بە گەشتەکەیەوە هەبوو.

کۆهتاکی چاوی داخست، بەڵام لە ترسا نەبوو، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو سەرنجی قوڵتر بکاتەوە دەربارەی ڕۆژی گەشتەکەی.

ئەو ڕۆژەی کۆهتاکی هەستی بە گۆڕانکاری دەکرد لە فوساجی دا، ئەو ڕۆژە بوو کە کۆهتاکی خوانی ئێوارەی ئامادەکردبوو، لە هەمان کاتدا فوساجی نەهاتبووە ماڵەوە

لەبەرئەوەی سەرقاڵی ئامادەکردنی باخچەیەک بوو، فوساجی کاتی تەواوی خۆی وەردەگرت لە ڕازاندنەوەی باخچەکاندا، ئەو وشەیەی زۆر دووبارەی دەکردوە؛ "وشەی هاوسەنگی بوو" ئاماژەی بەوە دەدا دەیگووت لەگەڵ ماڵەکاندا نابێت باخچەکان زۆر سەوز و پڕ گوڵ بن، ناشبێت چۆڵ و بێ ڕەونەق بێت، بەڵکو دەبێت هەمیشە هاوسەنگی بپارێزرێت.

دوای ئەوەی شەوێکی دوورو درێژی هەبوو، فوساجی بڕیار وەها بوو کە کۆهتاکی خواردنی بۆ ئامادە بکات و پێکەوە خوانی ئێوار بخۆن.

بوو بە شەو، بەڵام فوساجی هێشتا نەگەڕابوەوە ماڵەوە، کۆهتاکی بیری لای مابوەوە، بەڵام دواتر درکی بەوە کرد کە دەکرێت بۆ قاوەخواردنەوەیەک لە دەرەوە بێت.

لە کۆتایدا دوای تێپەڕبوونی دوو کاتژمێر لە کاتی ئاسایی گەڕانەوەی، فوساجی گەڕایەوە ماڵەوە، بەڵام جیاواز لە شەوەکانی تر هیچ لە دەرگای نەدا، هەموو شەوێک کە دەگەڕێتەوە سێ جار لە زەنگەکە دەدات تاکو کۆهتاکی بۆی بکاتەوە، بەڵام ئەمشەو بەو جۆرە نەبوو، کۆهتاکی خۆی هەستی بەوە کرد کەسێک دێتە ژوورەوە دوای ئەوەی بینی گوتی؛ "ئەوە منم".

دوای گوێبیستی دەنگەکە، دەرگاکەی کردەوە، هەرچەندە پێی وابوو کە شتێکی لێهاتووە، بەڵام فوساجی هیچی لێنەهاتبوو، وەکو ڕۆژەکانی پێشوو سەلامەت گەڕابوەوە ماڵەوە، جلە

ڕەساسییەکانی لەبەردا بوو، تەواوی کەلوپەلەکانی پێبوو، بە شەرمەوە گوتی: "ون بووم."

ئەمڕۆ دوو ساڵ تێپەڕ بووە بەسەر ئەو ڕووداوەدا.

لە شانسی فوساجیدا کۆهتاکی پەرستاربوو، هەر زوو هەستی بە نیشانەکانی دەکرد کە دەردەکەوتن. سەرەتا بەوە دەستی پێکرد، دواتر وای لێهاتبوو لەبیری دەکرد کەشەکە چییە، یاخود کاتژمێر چەندە، پاشان شەوان بەئاگا دەهاتەوە دەیگووت لەبیرم کرد ئەمڕۆ کارێکی گرنگ ئەنجام بدەم. بەڵام ئەوەی کۆهتاکی دەیکرد هەوڵیدەدا بیهێنێتەوە سەرخۆی و بە هێمنی مامەڵەی لەگەڵ دەکرد.

تەنانەت کۆهتاکی پزیشکی تایبەتی بۆ گرتبوو. ئامادەبوو هەموو کارێک بکات تاکو فوساجی چاک ببێتەوە لەو بارودۆخەی.

بەڵام هەر لەسەرەتاوە بەرەبەرە فوساجی شتی زیاتر و زیاتری لەبیر دەکرد، تەنانەت وای لێهات چیتر نەیدەتوانی بچێت بۆ سەر کارەکەی، هەر بۆیە زیاتر ئاگاداری ببێت کۆهتاکی ڕۆژە پشووەکانی لەگەڵ فوساجیدا دادەنا تاکو زیاتر گرنگی پێبدات.

تاکە شوێنێک کە دەیزانی هەندێک لەو جێیانە بوو کە پێشتر سەردانی کردبوو، سەرەڕای نەخۆشییەکەی تەنها ئەو ڕێیانەی بیرمابوو.

دوای ماوەیەک بەسەر نەخۆشییەکەیدا، بارودۆخەکە وەهای لێهاتبوو کارەکانی ڕۆژانەشی بیردەچووەوە، بە نمونە شتی دەکڕی، بەڵام دواتر دەیگووت کێ ئەم شتانەی کڕیووە، تەنانەت وای لێهات ناونیشانی ماڵەکەی خۆیانی بیر دەچووەوە، دەبوو پۆلیس بیدۆزیایەتەوە و بیگەڕانایەتەوە بۆ ماڵەوە، هەتا وای لێهات تەنانەت ناوی کۆهتاکیشی بیرچووەوە، بە ناوی دووەمی بانگی دەکرد.

دوای ئەو بیرهاتنەوانە کۆهتاکی چاوی کردەوە، پانکەکە دەنگی دەهات، قاوەخانەکە وەکو خۆی بوو، کۆهتاکیش لە جێی خۆی دانیشتبوو دەستەکانی لەسەر قاچەکانی دانابوو، بەڵام نەیدەزانی ئاخۆ شەوە یاخود ڕۆژە، چونکە وەکو پێشتر گووتمان قاوەخانەکە هیچ پەنجەرەیەکی تێدا نییە.

کازوو لەوێ نەبوو، تەنانەت کێ-شی لێنەبوو، سەرەتا هەوڵیدا دان بەخۆیدا بگرێت، بەڵام دواتر چاویگێڕا بەناو قاوەخانەکە دا، لە لایەکەوە دەنگی تەپەی پێی بیست کە کەسێک بەرەو لای دەهات.

"کەس لێرە نییە." بە شڵەژاوییەوە ئەو وشەیە لە دەمی هاتە دەرەوە.

تاکە هۆکار ئەوی گەڕاندبوەوە ڕابردوو خوێندەوەی ئەو نامەیە بوو کە دەبوو فوساجی بیداتێ، هەر لەبەر ئەوەش بوو ئەو ڕێگایەی بڕیبوو لە داهاتووەوە هاتبووە ڕابردوو.

هەرچەندە ئەو ڕووداوە ڕوویبدایە هیچ لەبابەتەکە نەدەگۆڕا،

چونکە فوساجی بە هیچ جۆرێک ئەوی بیر نەدەهاتەوە.

پێشتر درکی بەبابەتەکە کردبوو، سەرەتا پرسیاری کرد: ئاخۆ ئەوان پێشتر یەکتر دەناسن یاخود نا؟ بەڵام تەنانەت ئەگەر هاوسەرەکەم منی بیرنەیەتەوە منیش وەکو پەرستارێک دەتوانم لەگەڵی بم.

"دڵنیام ئەوە نامەیەکی خۆشەویستییە."

پاشان قومیدا لە کوپە قاوەکە.

کەسێک هاتە ناو قاوەخانەکە، شێوازی هاتنە ژوورەوە بەو جۆرە بوو کەسەکە دەبوو چەند پلیکانەیەک ببڕێت پاشان لە دەرگایەکی دوو مەتری گەورە دەهاتە ناو قاوەخانەکە، دواتر زەنگێک لای دەرگاکە لێی دەدا بۆ چەند چرکەیەک، پاشان بە دوو هەنگاو دەهاتیتە ژوورەوە.

کاتێک زەنگی هاتنە ژوورەوەکە لێی دا، سەرەتا کۆهتاکی وای بیرکردەوە ڕەنگە ناگاری یاخود کی بن هاتنە ژوورەوە، چونکە ئەگەر کازوو بوایە بێگومان وەکو خزمەتگوزاری دەهاتە لای مێزەکەی، بەڵام ئەوەی سەیربوو ونبوونی کازوو بوو لەو کاتەدا.

کۆهتاکی کۆمەڵە سیناریۆیەکی لە مێشکی خۆیدا تاوتوێ کرد، بەڵام ڕاستی بابەتەکە هیچ کام لەوانە نەبوو لە کۆتایدا کەسەکە دەرکەوت، فوساجی بوو.

"ئۆو کۆهتاکی"، ئەوەی پێشبینی نەکراوبوو لەو کاتەدا بۆ کۆهتاکی بینینی فوساجی بوو، پانتۆڵێکی بێجی و تیشێرتێکی

پۆلۆی لەبەردا بوو، جگە لەوەی جانتاکەی لەدەست گرتبوو، کەواتە پێدەچوو لە دەرەوە کەشەکە گەرم بێت.

بەهیچ جۆرێک لە جێگەکەی خۆی نەجولا، بەلام فوساجی هات بۆلای.

کۆهتاکی دەستپێشخەری کرد؛ "سلاوت لێبێت."

هەستی بە شتێکی سەیر دەکرد، چونکە لەوکاتەوەی یەکتر دەناسن تەنانەت پێش ئەوەی بگەنە بابەتی هاوسەرگیریش هەرگیز بەو جۆرە تەماشای نەکردبوو. هەرچەند کۆهتاکی هەولیدەدا دیمەنی سێ ساڵ بەر لەو کاتەی بیربێتەوە ئاخۆ بەم جۆرە تەماشای کردووە یاخود نا، بەلام هیچی بیر نەهاتەوە. پێی وابوو بە باشی بیری لەو ڕۆژە نەکردۆتەوە، چونکە هەستی دەکرد ئەم ڕۆژە تەنها سێ ڕۆژ پێش ئێستایە نەک سێ ساڵ بەرلە ئێستا.

فوساجی؛ "ئۆو سلاو بەڕاستی پێم وانەبوو لێرە بتبینم."

وا پێدەچوو بە تەواوی ئەو کاتە بێت پێش ئەوەی لەبیری بکات کۆهتاکی کێ بووە، هەروەکو ئەوەی خەیاڵی بۆ کردبوو کۆهتاکی.

"زۆر چاوەڕێم کردیت، بەلام نەهاتیتە ماڵەوە."

کۆهتاکی هەستی بەوە کردبوو شتێک لە ناو مێشکی فوساجی گەلالە بووە و بێزاری دەکات، دواتر گوتی؛ "هەر بەڕاستی ئەوە تۆی؟"

"هەی هوو".

کۆهتاکی؛ "دەزانیت کێم؟"

"چی؟"

تەنها دەیویست دڵنیابێتەوە ئەو کاتەی بۆی گەڕاوەتەوە بەتەواوی پێش نەخۆشی زەهایمەرەکەیەتی.

"تەنها ناوم بڵێ."

فوساجی؛ "ئایا تۆ دەتەوێت گاڵتەم پێ بکەیت؟"

بە زەردەخەنەیەکی خۆشحاڵییەوە گوتی؛ "نەخێر، بەو جۆرە نییە."

ئەم گفتوگۆ کورتە ئەوەی بە کۆهتاکی گووت کە هەموو شتێک باشە و ئەو کاتەی بۆی گەڕاوەتەوە کاتە ڕاستەکەیە، بە تەواوی ئەو کاتەیە پێش ئەوەی تووشی نەخۆشییەکەی ببێت و هاوسەرەکەی لەبیر بکات، هەر بۆیە قومێکی لە قاوەکە خواردەوە.

فوساجی؛ "ئەمڕۆ زۆر بە سەیری مامەڵە دەکەیت."
تاماشایەکی دەوروبەری خۆی کرد تاکو دڵنیابێت کەس سەرنجیان نادات.

بانگی ناگاری کرد؛ "ناگاری تۆ لە چێشتخانەکەیت؟"

کەس وەڵامی نەدایەوە، هەر بۆیە خۆی هەستایەوە و چووە ژوورەوە تاکو دڵنیابێتەوە کەسی لێیە.

چووە سەر کورسی و مێزی ژمێریارەکە دانیشت و گوتی؛ "بەڕاستی شتێکی سەیرە کەس لێرە نییە."

کۆهتاکی؛ "چییە؟"

"بۆچی لەوێ دانیشتوویت؟"

فوساجی؛ "بۆچی؟ چ کێشەیەک لەوەدا هەیە؟"

"بۆ نایەیت لێرە دانیشیت؟"

بە چاوی ئاماژە کۆهتاکی پێی گووت کە بێت لە کورسییەکەی بەرانبەری دابنیشێت، بەڵام گوتی؛ "نا من بەم جۆرە باشم."

"ژن و مێردێکی تازە هاوسەر بەم جۆرە لە دووری یەکتر دادەنیشن؟"

کۆهتاکی ڕاستی بابەتەکەی دەزانی، بەڵام نەیویست زیاتر لەسەری بڕوات، هەر بۆیە گوتی؛ "کەواتە باشە..."

دوای گوێگرتن لە قسەکانی کەوتە ناو خەیاڵەوە کۆهتاکی، بەڵام دواتر بە ئاگا هاتەوە بەرلەوەی قاوەکەی ساردببێتەوە دەبێت ئەرکەکەی جێبەجێ بکات، بەپەلە دەنگی بەرز کردەوە و بە شڵەژاوییەوە گوتی؛ "تەماشا بکە، بابەتێک هەیە دەبێت لێت بپرسم."

"چییە ؟"

"هیچ شتێک هەیە بتەوێت پێمی بدەیت؟"

لێدانی دڵی خێراتربوو بوو، لەلایەکی تریشەوە بیری دەکردەوە، ئاخۆ ئەو نامەیەی پێش نووسینی ئامادەی کردووە تاکو پێی بدات یاخود بۆ دواتر، ئاخۆ بابەتەکە خۆشەویستییە یاخود شتێکی ترە.

"چی؟"

"مەبەستم ئەمەیە دەربارەی ئەمە..."

...

ماوەیەک دوای هاوسەرگیرییەکەیان ئەو کاتەی بۆ یەکەمین جار فوساجی دیاری ڕۆژی لە دایکبوونی بۆ کۆهتاکی کڕیبوو، ئەو ڕۆژە کە دیارییەکەی پێدەدا، بەڵام دوای گەڕانەوەی لەسەر کارکردن کۆهتاکی بە پەرۆشییەوە لێی پرسی؛ "هیچ شتێکی تایبەت هەیە بتەوێت پێمی بدەیت؟"

بە ساردییەوە گوتی؛ "نەخێر".

بەڵام ڕۆژی دواتر کۆهتاکی دیارییەکەی لەناو زبڵدان دۆزییەوە.

دیارییەکە دەسرێکی ئەرخەوانی بوو، ئێستاش هەستی دەکرد هەمان هەڵەی دووبارە کردوەتەوە، چونکە خووی فوساجی بەو جۆرە بوو کە ئەگەر شتێک زۆر پێی بگوترایەتەوە ڕقی لێی بوو، بە زەردەخەنەیەک تەنها تەماشای کرد و هیچی نەگووت.

گوتی؛ "بمبورە مەبەستم هیچ شتێک نەبوو، تکایە لەبیری بکە."

دەستێکی لە کوپە قاوەکە دا، هێشتا پلەی گەرمییەکەی باش بوو؛ کەواتە هێشتا کاتم هەیە. دەیویست بە جۆرێک لە جۆرەکان وەها لە فوساجی بکات نامەکەی پێبدات، بەڵام نەدەبوو زۆری لێبکات، چونکە ئەگەری هەبوو نامەکە فڕێ بدات وەک لەوەی پێی بدات، لەوە دەترسا ئەگەر پرسیاری لێبکات و بڵێت؛ "تۆ باسی چی دەکەیت؟ چیت دەوێت؟"

هەر بۆیە هەوڵیدا بارودۆخەکە بگۆڕێت و بە ڕێگایەکی تر پەیامەکەی بگەیەنێت.

چاوی بڕییە نێو چاوی، هێشتا فوساجی لە حاڵەتی جدییەتدا مابوەوە، بەڵام ئەوە تا ڕادەیەکیش ئاسایی بوو بۆ کۆهتاکی، چونکە زۆربەی کاتەکان فوساجی بە جدی دەردەکەوت پێش ئەوەی تووشی نەخۆشی زەهایمەر ببێت.

فوساجی؛ "هممم، بیرم هاتەوە، دەزانم باسی چی دەکەیت."

هەستایەوە و پاشان چووە بەردەمی وەستا.

گوتی؛ "مەبەستت چییە؟"

"چی بووە؟"

"تۆ لە داهاتووەوە هاتوویت وایە؟"

"چی؟"

ئەوەی دەیگوت شێتانە بوو، بەڵام فوساجی ڕاستی دەکرد.

سەرەتا کەمێک بیری کردەوە ئاخۆ دەبێت ئەوەی پێ بڵێت لە داهاتووەوە هاتووە ئایا هیچ یاسایەکی لەو جۆرە بوونی هەیە؟ نابێت کاتێک دەگەڕێیتەوە ڕابردوو بڵێیت کە لەداهاتوەوە هاتوویت؟

"تەماشابکە، دەتوانم ڕوونی بکەمەوە..."

"پێم سەیربوو کە تۆ لەم جێیە دانیشتوویت."

"باشە...بەڵێ".

"کەواتە تۆ دەربارەی نەخۆشییەکەم دەزانیت."

کۆهتاکی تا ئەو کاتە پێی وابوو پێش کاتی تووشبوونی بە

نەخۆشییەکەی گەڕاوەتەوە بۆ ڕابردوو، بەڵام ڕاستییەکە وەها نەبوو، بەڵکو دوو ساڵ بوو فوساجی توشی نەخۆشییەکە بوو بوو، نیشانەکانیشی تێدا دەرکەوتبوو، بەڵام شاردبوویەوە.

ئەوەی کۆهتاکی دەیویست بگەڕێتەوە ئەو ڕۆژەی کە فوساجی هێشتا ئەوی بیرە، هێشتا توشی نەخۆشییەکەی نەبووە، هێشتا نامەیەکی پێیە دەیەوێت بیداتێ.

بەڵام پێدەچوو هێشتا نامەکەی بۆ نەنوسیبێت. بەو جۆرەی فوساجی لەبەردەمی وەستابوو باسی نەخۆشییەکەی کرد، کەواتە بابەتی نامەکە لەسەر نەخۆشییەکەیەتی.

"نەتدەزانی؟"

"دەیبینم."

هەرچەندە هەرچی بکەم هیچ لە ئێستا ناگۆڕێت، بەڵام ئەوەی لە داهاتووەوە بۆی هاتم نامەیەک بوو نەوەک زانینی نەخۆشییەکەی، ئەگەر بمزانیایە بارودۆخەکە وەهایە هەرگیز نەدەگەڕامەوە ڕابردوو.

زۆر زۆر هەستی بە پەشیمانی دەکرد دەربارەی گەڕانەوەکەی، فوساجیش هەروا بەبێ دەنگی مابوەوە.

"خۆشەویستم؟"

لەبەرخۆیەوە بە مینگە مینگ گوتی؛ "ئەو خۆشەویستەت کە نازانێت دەربارەی نەخۆشییەکەم."

"تەماشابکە من دەتوانم ئەوەت بۆ ڕوونبکەمەوە..."

"هەر ئەوکاتەی لەم کورسییە دانیشتبوویت هەستم بەوە کرد."

"بەڵێ ... باشە."

"کەواتە دەربارەی نەخۆشییەکەم دەزانیت."

زەرفە قاوەییەکەی دەرهێنا تاکو پیشانی بدات.

"بەڵام نامەویت بیخوێنمەوە، چونکە دەیزانم. بەڵام ئەو منەی کە باسم دەکرد ئەوەبوو کە لە داهاتوودا فوساجی بیری نەدەهاتەوە."

دوای ئەم گفوگۆیە دەبێت بگەڕێمەوە داهاتوو.

پلەی گەرمی قاوەکە نزیک بوو لە ساردبوونەوە، پاشان قاوەکەی نزیک کردەوە لە دەمی؛ "کەواتە من تۆ لە بیر دەکەم."

لەبەر خۆیەوە ورتەی دەهات، بەڵام تێنەدەگەیشت بۆچی کوپە قاوەکەی لەبەردەمە. هەرچەندە سەرنجی ناو چاوی دەدا هەرگیز بەو جۆرە نەیبینیبوو، بێدەنگییەکەی واتای بەڵێ بوو.

"دەزانم زۆر گۆڕاوم."

پاشان فوساجی سەری داخست. چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسک، چونکە لە دوای ئەوەوە نەخۆشییەکەی بەرەو پێش بچوایە زیاتر هەستی بە خەمۆکی دەکرد.

"ڕاستی بڵێم نەخۆشیەکەت باشتر نابێت."

من وەکو پەرستارێک گرنگیت پێدەدەم.

"بەو بۆنەیەوە لە داهاتوودا ئەوەی پێ گووتم."

دەتوانم هەر شتێکت بڵێم بێ ئەوەی ئێستا بگۆڕێت.

"هەست بەچی دەکەیت لەو کاتەدا؟"

ئایا هەستت چۆن دەبێت...

"بەڵێ ... باشە."

"کەواتە دەربارەی نەخۆشییەکەم دەزانیت."

زەرفە قاوەییەکەی دەرهێنا تاکو پیشانی بدات.

"بەڵام نامەوێت بیخوێنمەوە، چونکە دەیزانم، بەڵام ئەو منەی کە باسم دەکرد ئەوەبوو کە لە داهاتوودا فوساجی بیری نەدەهاتەوە."

دوای ئەم گفوگۆیە دەبێت بگەڕێمەوە داهاتوو.

پلەی گەرمی قاوەکە نزیک بوو لە ساردبوونەوە، پاشان قاوەکەی نزیک کردەوە لە دەمی؛ "کەواتە من تۆ لە بیر دەکەم."

لەبەر خۆیەوە ورتەی دەهات، بەڵام تێنەدەگەیشت بۆچی کوپە قاوەکەی لەبەردەمە. هەرچەندە سەرنجی ناو چاوی دەدا هەرگیز بەو جۆرە نەیبینیبوو، بێدەنگییەکەی واتای بەڵێ بوو.

"دەزانم زۆر گۆڕاوم."

پاشان فوساجی سەری داخست. چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسک، چونکە لە دوای ئەوەوە نەخۆشییەکەی بەرەو پێش بچوایە زیاتر هەستی بە خەمۆکی دەکرد.

"ڕاستی بڵێم نەخۆشیەکەت باشتر نابێت."

من وەکو پەرستارێک گرنگیت پێدەدەم.

"بەو بۆنەیەوە لە داهاتوودا ئەوەی پێ گووتم."

دەتوانم هەر شتێکت بڵێم بێ ئەوەی ئێستا بگۆڕێت.

"هەست بەچی دەکەیت لەو کاتەدا؟"

ئایا هەستت چۆن دەبێت...

بە تەواوی دەیویست دڕۆکەی بشارێتەوە، بەڵام چاوەکانی پڕ فرمێسک بووبوون، دەستی دەلەرزی.

"هەموو شت باش دەبێت."

هەموو شت باش دەبێت.

"تۆ چاک دەبیتەوە"

خەم مەخۆ

"تۆ چاک دەبیتەوە ئەمە ڕاستییە".

هەموو قسەکانی بە بڕوا بەخۆبوونەوە دەگووت.

بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی؛ "بەڕاستتە؟"

کۆهتاکی؛ "بەڵێ."

فوساجی نامەکەی دەستی بەرزکردەوە، مەودای نێوانیان هێندە نزیکبوەوە نامەکەی لەدەست وەربگرێت. بەشەرمەوە گوتی؛ "بگرە."

دوای وەرگرتنی فوساجی گوتی؛ "دواتر دەتوانیت فڕێی بدەیت."

تۆنی دەنگی گۆڕا، بە تەواوی شەرمی پێوەدەردەکەوت؛ "قاوەکەت بخۆرەوە بەرلەوەی ساردببێتەوە."

فرمێسک لە چاوەکانی دەهاتنە خوارەوە، کوپە قاوەکەی هەڵگرت و قومێکی لێخواردەوە، بەڵام هێشتا ئامادە نەبوو تەواوی بکات.

"خۆشەویستم."

ئەوە کۆتا دیداری خۆشەویستی نێوان ئەو دوو هاوسەرە بوو، دواتر بە یەک قوم تەواوی کوپە قاوەکەی خواردەوە. دەیزانی لە داهاتوو کی و کازوو چاوەڕێی دەکەن و نامەکەشی پێیە، بەڵام ناوەڕۆکی نامەکە دەربارەی وشەی خۆشەویستی نییە، گەڕایەوە داهاتوو، بەخێرای چاوەکانی کردەوە و زەرفی نامەکەی کردەوە، بە دەست و خەتی فوساجی خۆی نوسرابوو.

چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسک، کازوو بەپەلە بەرەو لای هات؛ "تۆ باشیت...کۆهتاکی؟"

کازوو نامەکەی لە دەستی وەرگرت، بە ئاماژەی چاو کی ڕێگەی پێدا نامەکە بخوێنێتەوە بە دەنگی بەرز، ئەمە دەقی نامەکە بوو؛

تۆ پەرستاریت، هەر لەبەر ئەوەیە دڵنیام تێبینی ئەوەت کردووە من تووشی نەخۆشییەک بووم کە شت لەبیر دەکەم. وە دڵنیاشم من داوای ئەوەت لێبکەم یاخود نا تۆ گرنگی بە من دەدەیت. من دانی پێدا بنێم یاخود نا من تۆ لەبیر دەکەم. بەڵام دەمەوێت داوای یەک شتت لێبکەم، ئەوەیش ئەوەیە؛ هەرگیز لەبیری نەکەیت تۆ هاوسەری منیت، دەمەوێت بەجێمبهێڵیت. نامەوێت لەگەڵمدا بمێنیتەوە وەکو پەرستارێک، ئەگەر من نەتوانم وەکو هاوسەرێک مافی خۆتت بۆ دابین بکەم. ڕاستە پێم خۆشە پێکەوە بمێنینەوە وەکو ژن و مێردێک، نەوەک نەخۆش و پەرستارێک، بەڵام پێم وابێت نەخۆشییەکەم ڕێگەم پێنادات. ئەمە تەواوی ئەو وشانەیە کە من ناتوانم ڕووبەڕوو بە تۆی بڵێم.

دوای تەواو کردنی خوێندنەوەی نامەکە، هەردوو کی و کۆهتاکی دایانە پرمەی گریان، کۆهتاکی لەوە تێگەیشت فوساجی بۆیە دەیویست بگەڕێتەوە ڕابردوو تاکو ئەوە بە هاوسەرەکەی بڵێت کە دوای تووشبوونی بە زەهایمەر وەکو پەرستارێک گرنگی پێنەدات، بەڵکو وەکو هاوسەرێک گرنگی پێبدات، کۆهتاکی درکی بەوە کرد تەنانەت خودی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەش کە بە دەست فوساجییەوە بوو دەربارەی کارەکەی نەبوو، بەڵکو ئەو شوێنانەی دەستنیشان دەکرد کە لەگەڵ هاوسەرەکەی سەردانیان کردووە.

لەو کاتەدا خاتوونە کراس سپییەکە گەڕایەوە لە دەستشۆرەکە، کۆهتاکی لەسەر کورسییەکە هەستایەوە، نامەکەی لە دەستی کازوو وەرگرت و گوتی: "کەواتە لەسەر من پێویستە چی بکەم؟"

کی بە شڵەژانەوە: "کۆهتاکی."

کۆهتاکی فرمێسکی چاوەکانی سڕی و بە بڕوابەخۆبوونەوە گوتی: "دەبێت من بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە."

پاشان ۳۸۰ یەنی لەسەر مێزەکە بەجێهێشت بۆ کازوو.

کازوو: "سوپاس."

پاشان بەپەلە لەدەرگاکە چووە دەرەوە، بەڵام ڕاستەوخۆ گەڕایەوە بە کی و کازووی گوت: "بەڵام شتێکی تر، لە سبەی بەدواوە نابێت بە ناوی دووەمم بانگم بکەن باشە؟"

کی: "زۆرباشە".

بەبێ ئەوەی چاوەڕێی وەڵامدانەوە بکات؛ "بە هەمووان بڵێن."

تەق تەق

کازوو گەڕایەوە لای ئامێری ژمێرەرەکە و پارەکەی کۆهتاکی کردە ناو ئامێرەکە، کی-ش کوپ و سینییەکەی لابرد لەبەردەم خاتوونە کراس سپییەکەدا، پاشان قاوەکەی بۆ نوێ کردەوە و پێی گوت؛ "خۆشحاڵبووین بە ئامادەبوونت لە قاوەخانەکەمان ئەم هاوینەش."

بەڵام خاتوونەکە هیچ وەڵامێکی نەدایەوە و بەردەوام بوو لە خوێندەوەی ڕۆمانەکەی.

هاوین دەستی پێکردبوو.

## III
## خوشکەکان

کچە گەنجەکە لەسەر کورسییەکە بەتەنها دانیشتبوو. بەشێوازی دەرکەوتنەکەی وا پێدەچوو لە قۆناغی ئامادەیی بێت. دوو چاوی گەورەی جوانی هەبوو. تەنورەیەکی کورتی بێجی و بلوسێکی ڕەش و جووتێک پووتی ڕەشی درێژی لەبەردا بوو، پاڵتوکەی لەسەر کورسییەکە دانابوو، شێوازی جلوبەرگەکەی لە تەمەنی زیاتر دەبوو، بەڵام ئەوەی وای کردبوو شیرین و لە تەمەن گەنج دەربکەوێت شێوەی دەمووچاوە شیرینەکەی و چاوە گەورەکانی بوو، قژی کورت بوو، کە لای پەنا گوێی بوو، هیچ جۆرە ئارایشتێکی نەکردبوو، برژانگە درێژەکانی چاوەکانی زیاتر دەرخستبوو، پێدەچوو لە داهاتووەوە هاتبێت تاکو کەسێک لێرە ببینێت.

ئەگەر ئەو یاسایەمان نەبووایە کە دەڵێت؛ نابێت لەسەر کورسییەکە هەستیتەوە، هەستایە و بەشەقامەکەدا ڕێی بکردایە، هەمووان هەستیان بە نامۆیی دەکرد لە شێوازی دەرکەوتنی کچەکەدا.

هێشتا ئەوە ئاشکرا نەبوو کە ئاخۆ هاتووە کێ ببینێت، لەو کاتەدا تاکە کەس کە لە قاوەخانەکە بوو ناگاری تۆکیتا بوو. ناگاری پیاوێکی باڵا بەرزی کەتەی چاو بچووک بوو، کە کڵاوێکی گەورە و جلوبەرگی چێشتلێنەری لەبەردابوو، لەودیو مێزی ژمێریارەکەوە وەستابوو.

هیچ نیشانەیەک ئەوەی پیشان نەدەدا کە ئەم کچە بۆ بینینی ناگاری هاتووە، سەرەڕای ئەوەی تەنها ئەو لەوێ بوو، چەند جارێک تەماشای ناگاری کرد، بەڵام تەماشاکردنەکەی ساردوسڕانە بوو، کچەکە هەموو ئەوەی دەیکرد لەو کاتەدا چەند جارێک تەماشای ناگاری کرد و پاشان چاوی لەسەر کاتژمێرەکە بوو، پێدەچوو خەمی تەواوبوونی کاتەکەی بێت.

لەوکاتەدا دەنگێک لە چێشتخانەکەوە هات، پێدەچوو ئامێرەکە سەموونی تۆستەکەی ئامادەکردبێت، ناگاری بەپەلە گەڕایەوە چێشتخانەکە تاکو سەموونەکە دەربهێنێت، پاشان کچەکە قومێکی لە قاوەکەی خواردەوە تاکو دڵنیاببێتەوە لە پلەی گەرمییەکەی، هێشتا گەرمبوو. لەو کاتەدا یۆکۆ هیرای هاتە ناو قاوەخانەکە و وەکو پیشەی هەمیشەیی لە نزیک مێزی ژمێریارەکە دانیشت.

ناگاری زۆر خۆشحاڵ دەبوو ئەو کاتەی کڕیارەکانی خواردنەکانی ئەویان لا بەچێژ دەبوو، چونکە تەواوی پێکهاتەکانی بۆ خواردنەکان بەکاری دەهێنان گرانبەها بوون، تەنها کەرەکە نەبێت کە بە خۆڕایی دەستی دەکەوت. سینییەکەی

بە دەستەوە گرتبوو، لەبەردەم کچەکە وەستا، کچەکەش هیچ قسەیەکی نەکرد، پاشان پرسی؛ "بۆ بینینی کێ هاتوویت؟"

کچەکە سەری هەڵبڕی بە سەرسامییەوە تەماشای کرد، پرسیارەکەی لا سەیر بوو، هیچ شتێکی نەگووت، تەنها بە سەرسوڕماوی تەماشای دەکرد.

ناگاری؛ "چییە؟"

کچەکە هێشتا هیچ وەڵامێکی نەبوو بۆی. قومێکی تری لە قاوەکە خواردەوە و گوتی؛ "هیچ کەسێک."

سینییەکەی لەبەردەم کچەکە دانا و بەبێدەنگی گەڕایەوە چێشتخانەکە، بەبێ ئەوەی هیچ قسەیەکی تر بکات، کچەکە بەم ڕەفتارەی هەستی بە نائارامی دەکرد. پێش ئەوەی بڕواتە ناو چێشتخانەکە کچەکە بانگی کرد؛ "ئۆو ببورە".

"چییە؟"

"من داوای ئەمەم نەکردبوو."

ناگاری مستی توند کردەوە و گەڕایەوە پشتی مێزی ژمێریارەکە و گوتی؛ "تۆ لە داهاتووەوە هاتوویت و زۆرت پێچووە تاکو گەشتوویتەتە ئێرە، ناتوانم بەبێ ئەوەی هیچ خزمەتێکت بکەم ڕێگەت بدەم بگەڕێیتەوە داهاتوو."

کچەکە بەبێدەنگی تەماشای دەکرد، بەبێ ئەوەی هیچ بڵێت، ناگاری چاوەڕێی ئەوە بوو لانی کەم سوپاسێکی بکات.

ناگاری؛ "کێشەیەکت هەیە؟"

"نەخێر، زۆر سوپاس دەیخۆم."

کچەکە کەرەکەی کردە سەر تۆستەکە و پاشان قەپالێکی لێگرت، ناگاریش چاوەڕێی کاردانەوەی بوو، بەڵام کچەکە نەک هیچی نەگووت، بەڵکو هیچ کاردانەوەیەکی ئەوتۆشی نەبوو، دوای تەواو کردنی تۆستەکە دەستی کرد بە خواردنی زەڵاتەکە، دوای ئەوەی تەواوی خواردنەکەی خوارد دەستەکانی خستەوە ناویەک بەبێ ئەوەی هیچ قسەیەک بکات.

لەو کاتەدا کازوو هاتە تەنیشت ناگاری؛ "من...." لەو کاتەدا تێبینی کچەکەی کرد بۆیە قسەکەی تەواو نەکرد.

ناگاری؛ "سڵاو". پاشان کلیلەکانی لە گیرفانی دەرهێنا، سڵاوکردنی ئەمجارەی جیاواز بوو، چونکە هەمیشە سڵاوەکانی بەم جۆرەیە، سڵاو بەخێربێیتەوە.

کازوو دەستەکانی خستە ناویەک و گوتی؛ "ئەو کچە کێیە؟"

کازوو زۆر پرسیاری دەربارەی ئەو جێگەیە نەدەکرد، چونکە هەر کاتێ کەسێک لەو جێیە دانیشتایە دەیزانی کە لە داهاتووەوە هاتووە تاکو چاوی بە کەسێک بکەوێت، بەڵام ئەوەی سەیربوو ئەمجارە کچێکی گەنج لەوێدا دانیشتووە.

کچەکە گوتی؛ "سڵاو". بە زەردەخەنەیەکەوە.

ناگاری بڕۆی هەڵتەکاند، پێی سەیر بوو کچەکە بەزەردەخەنەوە قسە دەکات.

کازوو؛ "هاتوویت چاوت بە کەسێک بکەوێت؟"

"بەڵێ".

ناگاری کەمێک توڕەیی دایگرت، چونکە چەند خولەکێک

لەوەوبەر لە کچەکەی پرسیبوو، بەڵام هیچ وەڵامی نەدایەوە، ئێستاش بەپەرۆشییەوە بۆ کازووی باس دەکات.

ناگاری؛ "بەڵام ئەوەی چاوەڕێی دەکەیت نەهاتووە وایە؟"

کازوو سەری سوڕما، کەواتە چاوەڕێی کێ دەکات؟ کازوو پەنجەی ئاماژەی بۆ ناگاری درێژ کردو گوتی؛ "کەواتە نەهاتوویت بۆ بینینی ئەو پیاوە؟"

ناگاری بە سەرسوڕمانەوە گوتی؛ "چی؟ من..."

کەمێک شڵەژاو گوتی؛ "ئەه ...مممم".

کچەکە نزیکەی دە خولەک دەبوو گەیشتبووە قاوەخانەکە، کازوو... کی بردبووە لای پزیشکەکەی پاشان هاتبووە قاوەخانەکە، جیاواز لە پیشەی هەمیشەیی کە ناگاری دەیبات بۆلای پزیشکەکەی.

(ئایا ئەو کاتەی دەستنیشان کردووە کە من بەتەنهام لێرە؟) ناگاری لێدانی دڵی کەوتە زیاد بوون.

(کەواتە ئەو ڕێگەیەی ئەو پێی هاتوە بۆ ئێرە ڕەنگە...) ناگاری لە کورسییەکەی بەرانبەر کچەکە دانیشت. کچەکەش تەنها تەماشای دەکرد.

ئەگەر شێوازی هەڵسوکەوتەکەی بەهۆی ئەوەوە بێت شەرمم لێدەکات، هەوڵدەدەم کەمێک کراوەتر بم لەگەڵیدا. ناگاری لە کچەکەی پرسی؛ "کەواتە ئەو کەسەی هاتوویت بۆ بینینی منم؟"

"نەخێر."

"هاتوویت بۆ بینینی من؟"

"نەخێر".

"من؟"

"نەخێر!"

"..."

کچەکە دەیزانی کازوو گوێی لە گفتوگۆکەیانە بۆیە گوتی؛ "کەواتە یاساکان دەزانیت."

ناگاری خۆی بە دەستەوەداو گوتی؛ "کەواتە باشە من نیم."

پاشان هەستا و گەڕایەوە لای مێزی ژمێریارەکە.

کچەکە بە زەردەخەنەیەکەوە تەماشای دەکردن.

زەنگی کاتژمێرەکە لێیدا، تاکە کاتژمێر کاتەکەی بە ڕاستی دەخوێندەوە ئەوەی ناوەڕاست بوو، دوانەکەی تر خاوتر یاخود خێراتر بوون. لەو کاتەدا کی هاتە ژوورەوە بۆ ناو قاوەخانەکە.

کی عەزییەکی پیرۆزەیی و جوتێک نەعل و کڵاوێکی گەورەی لەسەردا بوو، پێدەچوو دوای ئەوەی کازوو بەجێی هێشتووە سەردانی چەند فرۆشگایەکی کردبێت و هەندێک شتی کڕیبێت، کی کەسێکی لەو جۆرە بوو شەرمی لە دەوروبەرەکەی نەدەکردەوە، هەمیشە ئەو کارانەی دەکرد کە خۆی پێی ئاسودە دەبوو، جیا لەوەش لەگەڵ کڕیارەکاندا ببووە هاوڕێ. تەنانەت ئەگەر کەسەکان ژاپۆنیش نەبوونایە کێشەی نەبوو لەگەڵیاندا.

"سوپاس بۆ ئەمڕۆ کازوو."

کی تێبینی کچەکەی کرد لەسەر کورسییەکە دانیشتووە.

گوتی؛ "سڵاو بەخێربێیت."

تۆنی دەنگی بەرزتربوو لەکاتی ئاسایی، جیا لەوەش شێوازی گوتنەکەی کەمێک شڵەژانی پێوە دەردەکەوت. کچەکە بەبێ وەڵامدانەوە تەنها تەماشای دەکرد و هیچی تر،کی چووە ژوورەوە، پاشان ناگاری پرسیاری لە کی کرد؛ "ئەو کچە کێیە؟"

لەوکاتەی کی و ناگاری سەرقاڵی ئەم گفتوگۆیە بوون کچەکە بە دەنگی بەرز بانگی کردن؛ "ببورن."

کی؛ "بەڵێ".

کی؛ "ئمممم ئەوە..."

ناگاری؛ "بەڵێ، ئەوە چی؟"

"پێم خۆشە وێنەیەکت لەگەڵدا بگرم."

کی بە سەرسوڕمانەوە؛ "من؟"

"بەڵێ".

ناگاری بە سەرسوڕمانەوە تەماشای کی کرد و گوتی؛ "ئەو؟"

کچەکە؛ "بەڵێ".

کازوو؛ "کەواتە تۆ هاتوویت تاکو کی ببینیت؟"

"بەڵێ."

کی سەری سوڕمابوو، چونکە ئەوە یەکەمین جار بوو کەسێکی نەناسراو داوای شتێکی وای لێبکات، هەرچەندە دەبوو لەجیاتی ئەوە لێی بپرسێت بۆچی دەیەوێت وێنەی لەگەڵدا بگرێت، بەڵام گوتی؛ "دەتوانم ئارایشتەکەم نوێ بکەمەوە؟"

جانتای شانەکەی کردەوە بەمەبەستی ئەوەی ئارایشتەکەی نوێ بکاتەوە. دواتر کچەکە گوتی؛ "کاتمان زۆر نییە."

"بەدڵنیاییەوە نەخێر."

کی یاساکانی دەزانی، بۆیە بەخێرایی سەر ڕوومەتەکەی دەرهێنا و کەمێکی بەکارهێنا و پاشان، لەو کاتەدا کی چووە پاڵ کچەکەوە تاکو وێنەکە بگرن پێکەوە، کازوو بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسی؛ "کامێراکەت لە کوێیە؟"

کچەکە شتێکی لە گیرفانی دەرهێناو گوتی؛ "ئەم شتە کامێرایە؟"

شتێکی دەرهێنا هێندەی کریدیت کارتێک دەبوو، کی بە سەرسوڕماوییەوە تەماشای کرد؛ "ئەمە کامێرایە؟"

کچەکە؛ "کاتمان زۆر نییە پەلە بکە."

کی؛ "ئۆو داوای لێبوردن دەکەم."

کازوو؛ "ئامادەبن "

چرک

"چی... بوەستە وێنەکەت گرت؟"

کازوو کامێراکەی گەڕاندەوە بۆ کچەکە، چونکە لەو کاتەی کی سەرقاڵی چاککردنی قژی بوو، کازوو وێنەکەی گرتبوو.

"کەی وێنەکەت گرت؟ چۆن دەرچووە". کازوو و کچەکە لەو خاڵەدا هاوبەش بوون بێدەنگ بوون زۆر قسەیان نەدەکرد.

کچەکە گوتی؛ "زۆر سوپاس". پاشان ئەو قاوەیەی مابووەوە لە کوپەکەدا خواردییەوە ڕاستەوخۆ.

کی؛ "چی؟ خولەکێک چاوەڕێکە ئەوە تۆ باسی چی دەکەیت؟"

ساتی دواتر کچەکە وەکو ئەوەی ببێتە هەڵم دیار نەما و پاشان ژنە کراس سپییەکە هاتەوە جێگەی.

هەرسێکیان زۆر بە ئاسایی لە بارودۆخەکەیان دەڕوانی، لەکاتێکدا ئەگەر کڕیارێک ئەو شتەی ببینیایە ئەوا بێگومان شۆک دەبوو، پاشان بابەتەکە بە شاردا بڵاو دەبووەوە، بێگومان خاوەنی قاوەخانەکەش هیچ ڕوونکردنەوەیەکی نەدەبوو بۆ بابەتەکە. ژنەکە دووبـارە ڕۆمانەکەی گرت بەدەستەوە و دەستیکرد بە خوێندنەوە وەک ئەوەی هیچ شتێک ڕووینەدابێت، بەڵام بە دەستی ڕاستی پاڵی بە سینییەکەوە نا کە کوپ و قاوەکەی لەسەر بەجێ مابوو وەکو ئاماژەیەک بۆ ئەوەی بڵێت؛ دووریبخەنەوە.

لەو کاتەدا کی سینییەکەی هەڵگرت تاکو لای ببات، ناگاریش چووە چێشتخانەکە.

کی بەسەرسوڕمانەوە گوتی؛ "ئەو کەسە کێ بوو؟"

پاشان زەرفەکانی لە کازوو وەرگرت و چووە چێشتخانەکە، کازوو بە سەرسوڕماوی تەماشای کورسییەکەی دەکرد کە کچەکەی لێدانیشتبوو. بەلایانەوە شتێکی سەیربوو، چونکە ئەوە یەکەمین جار بوو کەسێک لە داهاتووەوە بێت و بیەوێت یەکێک لە ئەندامەکانی قاوەخانەکە ببینێت. کچەکە بە تایبەت هاتبوو تاکو کی ببینێت. بەڵام کازوو لە کەسی نەپرسی و لێکۆڵینەوەی نەکرد ئاخۆ ئەو کەسە کێ بوو؟ بۆچی گەڕاوەتەوە، چونکە

هەرچەندە خەڵک لە داهاتوو بهاتایە بۆ ڕابردوو یاخود بەپێچەوانەوە ئەوە کەس پرسیاری لێنەدەکرد، تەنانەت ئەگەر بکوژێک لە داهاتوو بهاتایە و لە ڕابردوو گولەی لە دڵی کەسەکە بدایە ئەوا هێشتا کاریگەری نەبوو، چونکە یاساکان بەو جۆرە بوون ئێستا بە هیچ جۆرێک ناگۆڕێت، هەرچەندە دەستکاری وردەکارییەکانی ڕابردوو بکەیت.

ئەگەر ئەو ڕووداوە بەڕاستی ڕوویبدایە و کەسێک کەسێکی بریندار بکردایە دواتر بانگی ئۆتۆمبێلی فریاگوزاری دەکرا پاشان کەسەکەیان دەبردە نەخۆشخانە، ئینجا لەوێش دەکرا پزیشکەکان بڵێن ئەم کەسەمان پێ ڕزگار ناکرێت، ڕەنگە جۆری خوێنەکەشی دەگمەن بوایە، پاشان هەموان لێی بێهیوا دەبوون، بەڵام هۆکارێک دەخوڵقا تاکو کەسێک بێت و ئەو کەسە ڕزگار بکات لە مردن، چونکە لە داهاتوودا ئەو کەسە دەبێت بژی.

ئەو کاتە پزیشکەکان دەیانگووت بە پەرجوو کەسەکە ڕزگاری بووە، ئەگەر یەک خولەک درەنگتر کەسەکە بهێنرایە بمردایە، یاخود یەک ملیم نزیکتربوایە لە دەمارێکی ئەوا کەسەکە دەمرد.

ئەمە گریمانەیەک بوو کە دەکرا ڕووبدا، هەر لەبەر ئەمەش بوو کازوو بە خەیاڵیدا نەدەهات کەسەکە کێیە کە لە داهاتووەوە دێت، یاخود چی دەکات. ناگاری لە چێشتخانەکەوە بانگی کرد؛

"دەتوانیت ئەو کارەم بۆ ئەنجام بدەیت؟"

کازوو چووە چێشتخانەکە، سینییەکەی بە دەستەوە بوو

کە کەمێک لەوەوبەر لەبەردەم خاتوونە کراس سپییەکە هەڵیگرتبوەوە. کازوو کەوتە بیرکردنەوە؛ ئایا ئەو کچە کێ بوو؟ بۆچی لە داهاتووەوە هات تاکو تەنها وێنەیەک لەگەڵ کی بگرێت و بگەڕێتەوە داهاتوو؟

ناگاری بۆ کازوو؛ "بەخێربێیتەوە."

(پێم وایە شتێکی گرنگ ڕوویداوە و لە دەستم چووە.)

کازوو سەری لەقاند. کۆهتاکی لە کار گەڕابووەوە، هاتە ژوورەوە بۆ ناو قاوەخانەکە؛ "سڵاو". کۆهتاکی بلوسێکی پۆلۆی سەوزی لەبەردا بوو لەگەڵ تەنورەیەکی سپی و پێڵاوێکی ڕەش و جانتایەکی ڕەشیشی لە شان بوو.

ناگاری؛ "سڵاو کۆهتاکی".

ناگاری قسەکەی ڕاست کردەوە؛ "ئۆو ببورە خاتوو فوساجی" سێ ڕۆژ دەبوو دوای گەڕانەوە کۆهتاکی بۆ ڕابردوو. جانتاکەی دانا و پاشان گوتی؛ "تکایە قاوەیەک".

ناگاری؛ "هەر ئێستا". پاشان گەڕایەوە چێشتخانەکە.

تەماشایەکی قاوەخانە بەتاڵەکەی کرد بێ هیوا بوو، چونکە ئەمڕۆ فوساجی نەهاتبوو، لەو کاتەشدا کازو سەرقاڵی بردنی قاوە بوو بۆ خاتوونە کراس سپییەکە.

کۆهتاکی؛ "من کاتی پشووی خۆم وەردەگرم."

هەرچەندە مانگی ئابی هاوین بوو، بەڵام کۆهتاکی وەکو هەمیشە تەنها قاوەی گەرمی دەخواردەوە و تامی قاوەی ساردی لا پەسەند نەبوو.

ناگاری كاتێك قاوەی ئامادە دەكرد بە ئامێرەكە، تەكنیكی كەفكردنی بەكاردەهێنا و پاشان ئامادەی دەكرد، بەمەش سەرنجی كڕیارەكانی بەلای خۆیدا ڕا دەكێشا و تامەكەی خۆشتر دەبوو، بەڵام بۆ كۆهتاكی بەو جۆرە نەبوو، بەڵكو قاوەكەی بە فلتەرەكە دەپاڵاوت، پاشان ئاوی گەرمی تێدەكرد، بەوە تامی قاوەكە خۆشتر دەبوو و كاریگەری لە پلەی گەرمی ئاوەكە نەدەكرد، بەم تەكنیكە دەگوترا تەكنیكی كلاسیكی ئامادەكردنی قاوە كە تەنها تایبەت بوو بە كڕیارە تایبەتەكان، دواتر پێشكەشی دەكرد.

كی بەوە ڕاهاتبوو كە ئامێری قاوەی ئۆتۆماتیك بەكاربهێنێت، ئامێرەكە چەند دوگمەیەكی لەسەربوو بۆ هەر تامێك دەتتوانی كرتە لە دوگمەیەك بكەیت، زۆربەی كڕیارەكان ئەم جۆرەیان لا پەسەند نەبوو، بەڵكو ئەوەی ناگارییان لا پەسەند بوو، كازووش بەشێوازی ناگاری قاوەی بۆ كڕیارەكان ئامادە دەكرد، بۆیە كڕیارەكان زۆر دڵخۆش دەبوون ئەو كاتەی ناگاری یاخود كازووی لێبوایە.

كۆهتاكی لەو كاتەی چاوەڕێی قاوەكەی بوو؛ "بەو بۆنەیەوە چەند ڕۆژێكە تێبینیم كردووە بارەكەی هیرای داخراوە. ئایا ئاگاداری ئەوەن شتێك ڕوویداوە؟"

هیرای لەنێو بارە بچوكەكەی دا خواردن و خواردنەوەی دانابوو كە جێی شەش مێزی تێدا دەبووەوە، بەڵام هەمیشە قەرەباڵغە، هەموو شەوێك بارەكەی كراوەیە، بەڵام كاتی

کردنەوەکەی بەپێی میزاجی هیرایە، تەنانەت هەندێک جار بەجۆرێک کڕیارەکانی چاوەڕێی دەکەن لەبەردەم دەرگاکەی دەوەستن تاکو دەیکاتەوە، بەڵام تەنها شەش کڕیاری سەرەتا دەتوانن دابنیشن، ئەوانەی تر دەبێت بەپێوە خواردنەوەکانیان بخۆنەوە.

ڕاستە بارەکە پیاوانە بوو تا ڕادەیەک، بەڵام گرنگیشی دابوو بە ئافرەتان، واتە هەمووان بێ جیاوازی دەیانتوانی سەردانی بکەن.

بەهۆی قەرەباڵغی و هەبوونی کڕیاری زۆرەوە زۆربەی کات هەندێک لە کڕیارەکان پارەی زیاتر یاخود دەرفەتی خانوو یاخود شوقەیان دەخستە بەردەمی، بەڵام هیرای هەمووی ڕەت دەکردەوە و جگە لە پارەی خواردنەوەکە هیچ پارەیەکی تری وەرنەدەگرت، کۆهتاکیش هەندێک جار سەردانی دەکرد بۆ خواردنەوە.

کۆهتاکی ئەمڕۆ تێبینی ئەوەی کردبوو کە دوو شەوە بارەکەی هیرای داخراوە و خەڵکی زۆر نۆرەیان بۆ گرتووە، بە باسکردنی ئەو بابەتە ناگاری دەموچاوی گۆڕا، کەوتە خەمی ئەوەی ئاخۆ بۆچی دوو ڕۆژە هیرای بارەکەی نەکردۆتەوە.

کۆهتاکی؛ "چی بووە؟"

ناگاری؛ "خوشکەکەی تووشی ڕووداوی هاتوچۆ بووە."

"ئۆو نەخێر!"

ناگاری؛ "بۆیە گەڕاوەتەوە ماڵەوە."

"چەندە خەمناکە."

کۆهتاکی زۆر خەمباربوو بە بیستنی هەواڵەکە، چونکە دوای ئەوەی هیرایماڵەوەی جێهێشتبوو، خوشکەکەی دەهات بۆ سەردانی تاکو بیبینێت و قەناعەتی پێبکات بگەڕێتەوە ماڵەوە، دوای ئەوەی بەوە ڕازی نەدەبوو هەموو مانگێک دەهات و سەردانی دەکرد، بەڵام هەموو جارێک هیرای خۆی لێدەشاردەوە تاکو چاوی پێنەکەوێت، کۆتا سەردانیش سێ ڕۆژ لەمەوپێش بوو، بەڵام وەک هەمیشە هیرای لەنێو قاوەخانەکەدا خۆی لە خوشکەکەی شاردەوە، دواتر ئەویش بە ناچاری گەڕایەوە ماڵەوە.

لەو کاتەدا ناگاری بە سەرسوڕماوی وەستابوو، چونکە ئیمەیڵێکی لە هیرای-یەوە پێگەیشتبوو کە بۆ کی ناردبوو، تیایدا باسی ڕووداوەکەی کردووە و پێی گوتووە کە بارەکە بۆ چەند ڕۆژێک دادەخرێت و جیا لەوەش میوانخانەکەشیان لە تۆکیۆ بە هەمان شێوە دادەخرێت.

سیندای جێیەکی بەناوبانگ بوو بۆ گەشتوگوزار و بە جوانییەکەی ناوبانگی دەکردبوو، تیایدا فیستیڤاڵی تاناباتا ئەنجام دەدرا: لەنێو درەختە بەرزە بامبۆکاندا، کاغەزیان دەهێنا و ڕەنگیان دەکرد، پاشان دەیانڕازاندەوە و دواتر بە درەختە بامبۆکانەوە هەڵیان دەواسی، زۆرێک لە خەڵکی ژاپۆن بڕوایان بەم کارە هەیە و دەڵێن بەخت و پارە و هاوسەرگیری دەهێنێت، یاخود هەر نیازێک کە بیانەوێت.

بە شێوەیەکی گشتی ڤیستیڤاڵەکە لە ٦ بۆ ٨ی مانگی ئاب دەخایەنێت، زیاد لە دوو ملیۆن گەشتیار بەشدار دەبن تێیدا، ئەم ڤیستیڤاڵە زۆربەی کات لە تاکاکورا ئەنجام دەدرێت کە نزیکی دە خولەک لە وێستگەکەی سیندایەوە دوورە.

ناگاری بە مۆنییەوە سڵاوی لە کۆهتاکی کرد، دوای؛ "سڵاو بەخێربێیت."

پاشان کی لە ژوورەکەی دواوە هاتە دەرەوە، دوای بیستنی زەنگەکە بە هەمان شێوە سڵاوی لە کۆهتاکی کرد؛ "سڵاو، بەخێربێیت."

لەو کاتەدا دەنگێکی تریان بیست؛ "ناگاری! کی! کەسی لێیە! کەمێک خوێم دەوێت!"

"هیرای ئەوە تۆیت؟"

کەس پێشبینی ئەوەی نەکردبوو کە هیرای بەم زووییە بگەڕێتەوە، چونکە چەند ڕۆژێک بەسەر پرسەی خوشکەکەی هیرای-دا تێپەڕیبوو، جیاواز لەوەش پێیان وابوو دوای پرسەکە دەبێت هیرای چیتر ئاگاداری میوانخانەکە بێت، بەڵام هیرای گەڕابوەوە، هێندەی سەرنجیان دا چاوەکانی ئاوسانیان پێوە دیاربوو لەگەڵ خەمباری. وا پێدەچوو هیرای خوێیەکەی بۆ بابەتێکی ڕۆحانی بوێت نەوەک بۆ زیادکردنی خواردنەکەی.

دووبارە بانگی کردنەوە، بەڵام بە دەنگێکی لەرزۆکەوە؛ "دەی خێرا بکەن!"

"خولەکێک چاوەڕێ بکە."

ناگاری بەپەلە خوێیەکەی بردو بەرەو لای دەرگاکە ڕۆیشت، هەمووان سەریان سوڕمابوو، وەها بیریان دەکردەوە کە کراسێکی ئاسایی وەکو هەمیشەیی لەبەردا بێت، بەلام ئەوە چۆن دەبێت لە کاتێکدا تازە خوشکەکەی مردووە، بەلام لەو کاتەی کی گەیشتە لای دەرگاکە هەمووان سەریان سوڕمابوو بەو دیمەنەی، بینیان لە جیاتی پێشبینییەکەیان کراسێکی ڕەشی درێژ و کڵاوێکی ڕەشی لەسەردا بوو، قژی ئاسایی بەستبوو، کەس چاوەڕێی ئەوەی نەدەکرد بەو شێوەیە دەربکەوێت، بە تەواوی ماتەمینی پێوەدەردەکەوت، چووە کورسی ناوەڕاست دانیشت و پاشان گوتی: "ببورن بۆ بێزارکردنتان دەتوانن پەرداخێک ئاوم بۆ بێنن تکایە؟"

کی: "بەدڵنیاییەوە".

کی گەڕایەوە چێشتخانەکە تاکو پەرداخە ئاوەکەی بۆ بهێنێت، ناگاریش خوێیەکەی هێشتا بەدەستەوە بوو لەبەرانبەری وەستابوو، کۆهتاکیش بەسەرسوڕمانەوە لێی دەڕوانی لە جێی خۆیەوە، چونکە ڕەفتارەکانی سەیر دەردەکەوتن، لەو کاتەشدا کی گەڕایەوە و پەرداخە ئاوەکەی لەبەردەمی دانا.

هیرای: "زۆر سوپاس."

پەرداخە ئاوەکەی بە یەکجار خواردەوە، پاشان داوای پەرداخێک ئاوی تری کرد: "پەرداخێکی تر تکایە."

کی پەرداخەکەی هەڵگرتەوە دووبارە گەڕایەوە چێشتخانەکە.

ناگاری؛ "هیرای؟"

"بەڵێ".

"چی لە خوێیەکە بکەم."

"چی بکەیت؟"

"مەبەستم لە ...."

"چی؟"

ناگاری؛ "زۆر بەداخەوەم دەربارەی لەدەستدانی..."

هیرای شێوەی دەموچاوی گۆڕا، کەمێک دڵتەنگی دایگرت، دواتر گوتی؛ "مەبەستت کومییە؟"

"بەڵێ بە دڵنیایەوە..."

"ڕووداوەکە چاوەڕوان نەکراوبوو بەداخەوە..."

کی گەڕایەوە پەرداخە ئاوەکەی لەبەردەمی دانا.

هیرای؛ "زۆر سوپاس بۆتۆ."

دوای ئـەوەی پـەرداخـی دووەمیشـی خـواردەوە؛ "وەکو ئەوەی دەیگێڕنەوە بە هەڵە لە شەقامەکە پەڕیوەتەوە، پاشان ڕووداوەکە ڕوویداوە."

بەجۆرێک بابەتەکەی باس دەکـرد وەکو بڵێیت بەسەر کەسێکی نەناسراودا هاتبێت.

"ئەمرۆ بوو؟"

"چی ئەمڕۆ؟"

کۆهتاکی؛ "پرسەکە بەدڵنیاییەوە."

"بەڵێ تەماشا بکە!" پاشان هەستایە سەرپێی و کەمێک خۆی بادا پێوەی وەکو مۆدێلەکان و گوتی؛ "چۆنە لێم هاتووە؟ هەست دەکەم وەکو ئەوەیە بە زۆر لەبەریان کردووم."

خوشکەکەی کۆچی دوای کردبوو، هەمووان لە قاوەخانەکە بۆی خەمباربوون، بەڵام هەڵسوکەوتی هیچ بەوە نەدەچوو کە هەستی پێبکات. کۆهتاکی ئارامی نەما، بە تورەییەوە گوتی؛ "بۆچی هێندە زوو گەڕاویتەتەوە؟" لە ڕاستیدا دەیویست پێی بڵێت؛ "چەند بێ ڕەوشتانەیە ئەم ڕەفتارانە لە کاتێکدا خوشکەکەت مردبێت، ئەی وانییە؟"

دانیشتەوە لەسەر کورسییەکەی و گوتی؛ "بابەتەکە پەیوەندی بەوەوە هەیە منیش بارێکم هەیە دەبێت ئاگاداری ببم."

بە تەواوی تێگەیشت کۆهتاکی دەیەوێت بڵێت چی هەر لەبەرئەوەش بوو خۆی بەو قسەیە پەڕاندەوە.

"بەڵام هێشتا..."

"تکایە لێیبگەڕێ."

پاشان لەناو جانتاکەی جگەرەیەکی دەرهێنا، ناگاری بە سەرسوڕمانەوە تەماشای دەکرد، گوتی؛ "ئایا تۆ باشیت؟"

"لەبەرچی؟"

لەو کاتەدا سەرقاڵی دەرهێنانی چەرخەکەی بوو تاکو جگەرەکەی پێ دابگیرسێنێت.

ناگاری بە نیگەرانییەوە؛ "خوشکەکەت مردووە پێت وانییە دەبوو لەگەڵ دایک و باوکتدا بمایتایەتەوە کەمێکی تریش، تاکو چاک دەبوونەوە."

هیرای دوای داگیرساندنی جگەرەکەی: "باشە، لە ڕاستیدا ئەمە کێشەکەیە."

فومێکی لە جگەرەکە دا و بۆن دوکەڵ و گوڵ بڵاو بویەوە، پاشان بەردەوام بوو، گوتی: "بەڵام ئەوەتا وەک دەبینیت لێرەم."

سەرنجی ئەوەی دا کە کوەتاکی و ناگاری چۆن سەرسیان سوڕماوە، هەر بۆیە گوتی: "من چیتر هی ئەو جێیە نیم کە لێوەی هاتووم."

کی بە سەرسامییەوە پرسی: "مەبەستت چییە؟"

"کارەساتەکە بەم جۆرە بووە، لەوکاتەی لە ڕێی گەڕانەوەی بووە بۆ ماڵەوە کە هاتبوو بۆ بینینی من تووشی ڕووداوەکە بووە، هەر بۆیە دایک و باوکم سەرزەنشتی من دەکەن لە بەرانبەر مردنی خوشکەکەم."

کی: "ئەوان چۆن کارێکی لەو جۆرە دەکەن؟"

"بەڵام کردیان... لە لایەکیشەوە بیری لێدەکەمەوە ڕاست دەکەن."

هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی و بەردەوام بوو لە قسەکەی: "ئەو بەردەوام و بەردەوام دەهات بۆ بینینی من، هەموو جارێکیش من ئەوم ڕەت دەکردەوە."

کۆتا جار کی یارمەتی هیرای دابوو تاکو خۆی بشارێتەوە لە خوشکەکەی، ئەمەش وای کردبوو هیرای هەست بە پەشیمانی بکات دەربارەی ئەو کارەی. بە زەردەخەنەیەکی ساختەوە گوتی: "دایک و باوکم ڕەتی دەکەنەوە قسەم لەگەڵدا بکەن."

تەنانەت دەربارەی مردنی خوشکەکەی پەیوەندییان پێوە نەکردبوو، بەڵکو لە ڕێگەی کارمەندی پرسگەی میوانخانەکەوە هەواڵی مردنی خوشکەکەی زانیبوو، هیرای هەرگیز وەڵامی ئەو پەیوەندییانەی نەدەدایەوە کە لە میوانخانەکەوە دەهاتن. بەڵام ئەو بەیانییە کاتێک لە زەنگی تەلەفۆنەکەی بەئاگا هاتبوەوە و ژمارەی میوانخانەکەی بینیبوو ڕاستەوخۆ دڵی داخورپابوو، ئاخۆ شتێک ڕوویداوە! پەشان بەچاوی پڕ گریانەوە هەموو ئەوەی توانیبووی بە کارمەندەکە بڵێت ئەوەیە کە ئێستا دەگەمە ئەوێ و ڕاستەوخۆ کەلوپەلەکانی کۆکردبوەوە و گەڕابوەوە لای خێزانەکەی.

بەپەلە بە تاکسی گەیشتبووە میوانخانەکە، هەرچەندە ڕێگەکە نزیکی پێنج کاتژمێر دەبوو، جیا لەوەش لەبەر ئەوەی تاکسییەکە بە خێرایی دەڕۆیشت نزیکەی ٥١٠٠٠٠ یەنی لێسەندبوو، هەرچۆنێک بێت ئەوەی بەلاوە گرنگ نەبوو.

کاتێک لە تاکسییەکە دابەزی ئەو کاتە بەوەی زانیبوو هەر بە نەعلەکانی پێیەوە و لەفەکەی قژییەوە لەماڵ ڕۆیشتبوو، تەنانەت جلەکانیشی نەگۆڕیبوو، بەپەلە بەرەو ماڵی خێزانەکەی ڕۆیشت کە لە تەنیشت میوانخانەکە دروستیان کردبوو، شێوازی خانووەکەیان وەکو خانووە کلاسیکەکانی ژاپۆن بوون.

سیانزە ساڵ تێپەڕ بوو بوو بەسەر دواین جاردا کە لێرە ژیابوو، بەڵام هیچ شتێک نەگۆڕابوو، هەمووی لە جێی خۆی بوو. دەرگاکەی کردەوە، بەڵام ژوورەوە وەکو سەهۆڵ

ساردبوو، خۆشبەختانە چاکەتی گەرمی لەبەردا بوو کە بۆ ئەو کاتەی گونجاو بوو، دوای ئەوەی چووە ژووری دانیشتنەکە هیچ کەسێکی بەدی نەکرد، پێدەچوو ماوەیەکی زۆربێت خانووەکە چۆڵ کرابێت، بەلام دوای ئەوەی چووە ژوورە گەورەکە تەواوی خێزانەکەی لەوێ دانیشتبوون.

باوکی لە سوچێکی ژوورەکە دانیشتبوو بە خەمبارییەوە، کومیش لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا دانرابوو بە جلە سپییەکانییەوە کە گوڵی کیمۆنی پەمەیی بەسرەوە بوو، بەلام دایکی کومی لەوێ نەبوو.

هیرای دەستی لە دەموچاوی خوشکەکەی دا، پاشان چپاندی بە گوێیدا و گوتی سوپاس بۆ خودا، سوپاس گوزارییەکەی لە بەرانبەر ئەوە بوو کە جەستەی و دەمووچاوی کومی هیچ زیانێکیان بەرنەکەوتبوو هەرچەندە ئەو ئۆتۆمبێلەی لێیدا بوو بارهەڵگربوو.

هیرای ڕووی کردە باوکی و بانگی کرد؛ "باوکە..."

ئەوە یەکەمین گفتوگۆی نێوان هیرای و باوکی بوو دوای سیانزە ساڵ.

ئەو ڕۆژە هەروا لەناو ماڵەکە مایەوە بەبێ ئەوەی باوکی هیچ قسەیەکی لەگەڵدا بکات، ڕۆژی دواتر دایکی لە پرسەکە بینی، چاوەکانی نوقمی گریان بووبوون، دایکی لەجیاتی لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکە دابنیشێت لەگەڵ ماتەمین گێڕەکان دانیشتبوو. ماتەمینییەکە زۆر بەهێمنی بەڕێوەدەچوو، هیرای

بەنێویاندا تێپەڕبوو بەبێ ئەوەی هیچ قسەیەکیان لەگەڵدا بکات.

جگەرەیەکی تری دەرهێنا و پاشان قومێکی لێدا و گوتی؛ "بەڵێ بەم جۆرە بوو چیرۆکەکە."

هەر یەکە لە ناگاری و کی و کۆهتاکی خەمباربوون لەبارەی چیرۆکەکەیەوە. هیرای بە خەمبارییەوە گوتی؛ "بەڕاستی بیڵێم من هیچ باش نیم لەگەڵ هەموو ئەم ڕووداوانەدا."

کی؛ "هیرای..."

هیرای دەستی بێدەنگبوونی بەرزکردەوە؛ "هیچ خەمبار مەبن و پێشم مەڵێن من باشدەبم."

دەیزانی شتێک هەیە کە کی دەیەوێت بیڵێت، هەر بۆیە بەو جۆرە بەرگریی کرد.

"تەماشا بکەن هاوڕێیان، دەزانم وەها دەرناکەوم، بەڵام من بەڕاستی زۆر زۆر خراپم و هەست بە خراپی دەکەم، بەڵام پێویستە کارێک بکەم بتوانم لەسەر پێیەکانی خۆم بوەستمەوە، ئەی وانییە؟"

تا ڕادەیەک قسەکەی ڕاستبوو، چونکە ئەگەر کی بوایە بێگومان ئێستا نەیدەتوانی بەو جۆرە لەسەر پێیەکانی خۆی بوەستێت، ئەگەر کۆهتاکی بوایە ئەوا بۆ ماوەی چەندین ڕۆژ دەگریا بە بەردەوامی، بەڵام هیرای زۆر خۆڕاگرە دەربارەی ڕووداوەکە.

هیرای؛ "من دەگریم، بێگومان دەگریم، بەڵام هەر کەس لە کەسێکی تر جیاوازە."

پاشان جانتاکەی هەڵگرت و هەستایەوە سەرپێ و گوتی؛ "بۆیە شتەکان بەو جۆرەیە."

ناگاری بە سەرسوڕمانەوە پرسی؛ "کەواتە بۆچی سەردانی قاوەخانەکەت کرد بەم کاتە؟"

هیرای بۆ ساتێک وەستا. ناگاری درێژەی پێدا؛ "بۆ ڕاستەوخۆ نەچوویتەوەماڵەوە و هاتیتە ئێرە؟"

گەڕایەوە جێگەکەی خۆی دانیشت.

کی؛ "هیرای، هێشتا لەلامە."

هیرای؛ "هێشتا فڕێت نەداوە؟"

مەبەستیان ئەو نامەیە بوو کە سێ ڕۆژ بەر لە ئێستا کومی لای کی بەجێی هێشتبوو تاکو بیدات بە هیرای، بەڵام هیرای گوتبووی کە فڕێی بدات، چونکە نایەوێت بیخوێنێتەوە.

دەستی دەلەرزی، لەو کاتەی نامەکەی وەرگرت، چونکە ئەوە کۆتا وشەکانی کومی بوو کە بۆی نوسیبوو.

کی بە خەمبارییەوە گوتی؛ "هەرگیز پێم وانەبوو لە بارودۆخێکی لەم شێوەیەدا نامەکەت پێبدەم."

"نەخێر کێشە نییە...سوپاس."

نامەکەی دەرهێنا لەنێو زەرفە داخراوەکەدا. هەر کە تەماشای نامەکەی کرد تێبینی ئەوەی کرد هەمان بابەتەکانی جارەکانی پێشووی لێنوسراوە، هەربۆیە فرمێسک لە چاوی کەوتە خوارەوە.

"بۆ جارێکیش ئامادە نەبووم بیبینم، هەموو جارێک دەهات و دەهات بۆ تۆکیۆ بۆ بینینم، تاکو ئەمە ڕوویدا."

یەکەمین جار کە کومی هات بۆ سەردانکردنی هیرای، ئەو کات هیرای تەمەنی بیست و چوار ساڵ بوو، کومی تەمەنی هەژدە ساڵ بوو، بێگومان کە هیرای میوانخانەکەی بەجێهێشتبوو ماوەیەکی زۆر پێش ئەوە بوو ئەو کاتەش هەموو بەرپرسیارییەتییەکانی میوانخانەکە کەوتبووە ئەستۆی کومی، هەرچەندە هێشتا تازە لە قۆناغی ئامادەیدا بوو، واتە زۆر منداڵ بوو بۆ هەڵگرتنی ئەو بەرپرسیارییەتییە گەورەیە، چونکە دایک و باوکی وەکو خاوەنی میوانخانەکە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرد، لە دوای ڕۆیشتنی هیرای سەرەتا کە کومی سەردانی هیرای دەکرد ئاسایی دەیبینی، بەڵام دواتر خۆی لێدەشاردەوە و چیتر ئامادە نەبوو قسەی لەگەڵدا بکات، بەڵام کومی بەپێی دەرفەت هەر دوو مانگ جارێک دەهات و سەردانی دەکرد.

کۆتاجار کە هاتبوو بۆ سەردانکردنی هیرای ئەو ڕۆژە بوو کە نامەکەی بۆ بەجێ هێشتبوو، بەڵام ئامادە نەبوو نامەکە بخوێنێتەوە و داوای لە کی کرد نامەکە فڕێ بدات، کی نامەکەی هەڵگرتبووەوە بۆ ئەمڕۆ.

هیرای؛ "یاساکان دەزانم، ئێستا ناگۆڕێت، هەرچەندە بە سەختی هەوڵ بدەیت، بەڵام دەتوانیت بمگەڕێنیتەوە ئەو ڕۆژە؟"

"..."

هیرای بە جدییاتەوە گوتی؛ "لێت دەپاڕێمەوە تکایە!"

ناگاری بەو ڕەفتارە توڕ بووبوو، چونکە دەیویست بگەڕێتەوە سێ ڕۆژ لەوەوەبەر، ئەوکاتەی کومی سەردانی قاوەخانەکەی کردبوو، هەریەکە لە کی و کۆهتاکی چاوەڕێی ناگاری بوون قسەیەک بکات، تاکە کەس لە نێو قاوەخانەکەدا بە ئاسایی بەردەوام بوو لە کارەکەی خۆی ژنە کراس سپییەکە بوو ڕۆمانەکەی دەخوێندەوە، ناگاری قوتووە خوێیەکەی لەسەر مێزی ژمێریارەکە دانا بە تورەییەوە.

زرم

پاشان بە توورەییەوە چووەوە چێشتخانەکە.

هیرای بە نائومێدییەوە هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی، لەو کاتەدا ناگاری لە چێشتخانەکە بانگی کازووی کرد.

"بەڵام هیرای___"

"بەڵێ، دەزانم."

هیرای قسەکەی بە کۆهتاکی بڕی، هەر لەبەرئەوەش گوێی لەوە نەبوو کە چی گوت، چووە نزیک خاتوونە کراس سپییەکە و پێی گوت؛ "ببورە دەتوانم لە جێگاکەت دابنیشم؟"

کی؛ "هی___هیرای!"

هیرای بەبێ ئەوەی گوێ بە کی بدات دەپاڕایەوە و دەیگوت؛ "تکایە تکایە!" بەڵام خاتوونی سەر کورسییەکە تەنانەت ئاوڕیشی لێنەدایەوە، هیرای بە تورەبوونەوە گوتی؛ "خاتوون تۆ گوێت لە منە؟ تکایە فەرامۆشم مەکە دەتوانم بێمە جێگەکەت دابنیشم؟" پاشان دەستی لەسەر شانی ژنەکە دانا.

کی؛ "نەخێر، هیرای نابێت بوەستە."

بەبێ گوێدانە هیرای بەردەوام بوو لە پاڕانەوە؛ "تکایە!"

کی هاواری کرد بەسەریدا؛ "هیرای بوەستە!"

بەڵام لەو ساتەدا هیرای هەستی کرد دەستی قورسبوو، جەستەی خاتوونەکە بەرەو قورسبوون دەچوو لەژێر دەستی، تەواوی قاوەخانەکە لەبەرچاوی دەجولا، زەوییەکە لەژێر پێی دەلەرییەوە، پاشان هەناسەی توند بوو، ماسولکەکانی گرژبوون و کەوت.

"ئەمە...ئەمە چی بوو؟"

کی بە توڕەبوونەوە؛ "پێم گوتیت بەڵام تۆ گوێت نەگرت."

هیرای دەربارەی تەواوی یاساکان زانیاری هەبوو، بەڵام ئەوەی نەزانیبوو دەربارەی جادووەکە.

بە دەنگی بەرز؛ "ئەو شەیتانە...خێوە".

کی بە بەرەنگارییەوە؛ "نەخێر، ئەو تەنها تارماییەکە."

لەوکاتەدا کازوو لەچێشتخانەکەوە گەڕایەوە و کوپەکەی بەردەم خاتوونەکەی هەڵگرت و گوتی؛ "دەتەوێت قاوەکەت بۆ نوێ بکەمەوە؟"

خاتوونەکە بە هێمنیەوە پێی گوت؛ "بەڵێ تکایە".

کازوو تاکە کەس بوو کە جادووەکە کاری تێنەدەکرد، تەنانەت چەندین جاریش ناگاری و کی هەوڵیان دابوو قاوەی بۆ ببەن، بەڵام بێسود بوو، چونکە تووشی جادووەکەی دەبوونەوە، دوای چەند خولەکێک هیرای گەڕایەوە بارودۆخی

ئاسایی خۆی.

هیرای بە گریانەوە؛ "کازوو تکایە شتێکی پێ بڵێ با هەستێت لە جێگاکەی."

"تێدەگەم بەچیدا تێدەپەڕیت هیرای."

"کەواتە شتێکت پێ دەکرێت؟"

کازوو؛ "ببورە من هیچم لە دەست نایەت."

هیرای دەستی کازووی گرت و لێی پاڕایەوە؛ "تکایە، تکایە ئەوە بۆ من بکە!"

کازوو؛ "باشە با ئەمە تاقیبکەینەوە."

کازوو بەرەو لای خاتوونەکە ڕۆیشت، هیرای-ش وەستابوو تەماشای دەکرد چی ڕوودات.

کازوو لە خاتوونەکەی پرسی؛ "قاوەکەت بۆ نوێ بکەمەوە؟"

هەرچەندە هێشتا کوپە قاوەکەی پڕ بوو بوو. هیرای و کۆهتاکی بەبێدەنگی وەستابوون بەبێ ئەوەی هیچ قسەیەک بکەن تەماشای بارودۆخەکەیان دەکرد ئاخۆ چی ڕوودات. خاتوونەکە داوای کرد قاوەکەی بۆ نوێ بکاتەوە؛ "بەڵێ، تکایە."

خاتوونەکە کوپە قاوەکەی خواردەوە کە چەند خولەکێک لەوەوپێش بۆی هێنابوو، دواتر کوپە قاوە نوێیەکەی بۆ برد، خاتوونەکە بەردەوام بوو لە پەرتووک خوێندنەوە وەک ئەوەی هیچ شتێک ڕووینەدابێت.

پاش کەمێک...

کازوو دووبارە لێی پرسی؛ "قاوەیەکی ترت بۆ بێنم؟"

خاتوونەکە هێشتا دەستی لە کوپە قاوە نوێیەکە نەدابوو، بەلام دووبارە وەلامی دایەوە: "بەڵێ، تکایە".

دووبارە قاوەکەی بۆ نوێ کردەوە.

کۆهتاکی بە سەرسوڕمانەوە پرسیاری لە کازوو کرد: "کەواتە پێت وایە کار بکات..."

کازوو بەردەوام بوو، جار لە دوای جار بە تازەکردنەوەی قاوەکە بۆ خاتوونەکە: "قاوەیەکی ترت بۆ بێنم؟" خاتوونەکەش بەردەوام بوو لە داواکردنی قاوە بە: "بەڵێ، تکایە". پاشان قاوەکەی ڕاستەوخۆ دەخواردەوە، بەلام پاش کەمێک خاتوونەکە زۆر نائارام دەردەکەوت. بەلام ئەمجارەش کوپە قاوەکەی خواردەوە هەرچەندە ئەوە حەوتەمین کوپە قاوە بوو، بەلام خواردییەوە.

کۆهتاکی: "باشە زۆر نائارام دەردەکەوێت، بۆچی خواردنەوەکەی ڕەت نەکردەوە؟"

کی چپاندی بە گوێی کۆهتاکیدا: "ناتوانێت ڕەتی بکاتەوە".

"بۆچی؟"

کی: "لەبەرئەوەی یەکێکە لە یاساکان".

کۆهتاکی بە سەرسوڕمانەوە: "ئای خودایە..." سەرسامییەکەی کۆهتاکی بەهۆکاری ئەوە بوو کە تەنها ئەو کەسانەی دەگەڕێنەوە ڕابردوو پەیڕەوی یاساکان ناکەن، بەلکو ئەوانەشی تووشی جادووەکە دەبن دەبێت یاساکان پەیڕەوبکەن. کازووش قاوەی هەشتەمی بۆ خاتوونەکە تێکرد

و دووبارە پرسیاری کردەوە؛ "قاوەیەکی ترت بۆ بێنم؟"

دوای ئەوەی کازوو قاوەی نوێیەمی بۆ خاتوونەکە تێکرد، خاتوونەکە هەستایە سەرپێ لەسەر کورسیەکەی. کۆهتاکی هاواری کرد؛ "هەستایە سەرپێ!"

خاتوونەکە لەبەردەم خۆیەوە بە کازووی گوت؛ "توالێت".

هیرای؛ "سوپاس" پاشان بەپەلە لەسەر کورسییەکە دانیشت. بەڵام دڵەڕوکێکەی تەواوی کەسەکانی قاوەخانەکە هەستیان پێکردبوو، چونکە هەناسە بڕکێی بوو، تەقە تەقی دەکرد بە پەنجەکانی لەسەر مێزەکە.

کومی هەمیشە کە دەهاتە قاوەخانەکە و بانگی خوشکەکەی دەکرد پێی دەگوت؛ "دادە".

میوانخانەکە چوار وەرزی ساڵ قەرەباڵغ بوو، هەر لەبەر ئەوەش دایکی و باوکی بەردەوام سەرقاڵ دەبوون پێی. دایکی هیرای کە ناوی میچیکۆ بوو هەر زوو دوای لە دایکبوونی کومی گەڕایەوە سەرکارکردن و تەنانەت هیرای ناچاربوو ئاگاداری خوشکە بچوکەکەی ببێت، لەو کاتەی خۆی منداڵێک بوو تەنها تەمەنی شەش ساڵان بوو، تەنانەت کە کومیش چووە خوێندنگا دەبوو هیرای لەگەڵیدا بێت چاودێری بکات. دایک و باوکی هیرای هەمیشە هیوایەکی گەورەیان بە کچەکەیان هەبوو، چونکە کچۆڵەیەکی زیتەڵە و وریا و کۆمەڵایەتی بوو، هیرای دەیویست شتەکان بە ویستی خۆی بکات و خەمی ئەوانی تری نەبێت، یاخود قورسایی ئەرکی ئەوانیش هەڵبگرێت

و پاشان دەبوو خوشکەکەی بە کوڵ بگەڕێنێتەوە ماڵەوە. هیرای بەرەبەرە لە فەرمایشتەکانی دایک و باوکی بێزار دەبوو.

هیرای لە دایک و باوکی بێزار نەبوو، بەڵکو تەنها دەیویست بە سەربەخۆیی بژی، هەر لەبەر ئەوەش کە بوو بە هەژدە ساڵ ماڵەوەی بەجێهێشت، ئەو کات کومی تەمەنی دوانزە ساڵ بوو. دایک و باوکی بەم هەواڵە زۆر تووڕەبوون لە ڕەفتارەکەی هیرای، چونکە بارێکی قورسی بەسەر دایک و باوکیدا بەجێهێشتبوو. کومی هەرچەندە دڵشکاوبوو بە بڕیاری خوشکەکەی، بەڵام هەموو ئەوەی گوتی تەنها ئەوە بوو: "ئەو زۆر خۆپەرستە."

کازوو لە تەنیشت هیرای-یەوە وەستابوو سینییەکی بە دەستەوە بوو کە لەسەر سینییەکە کوپێک و کترییە ڕەساسییەکەی لەسەر بوو، گوتی: "یاساکان دەزانیت؟"

"بەڵێ، دەیزانم."

کومی پێشتر چەند جارێک سەردانی قاوەخانەکەی کردبوو، بەڵام هێشتا ئەو ڕاستییەی نەدەگۆڕی کە ئێستا مردووە، هیرای دەیزانی دەبێت لەسەر ئەو کورسییە دابنیشێت تا کۆتایی، پاشان کاتەکەی دیاری کراوە و بۆ کۆتاجار کومی دەبینێت. هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی و ئامادە بوو.

هەرچەندە یاساکانی دەزانی، بەڵام کازوو بەردەوام بوو لە ڕوونکردنەوە: "ئەو کەسانەی کە دەگەڕێنەوە ڕابردوو دەبێت هەمان هەستی ئەو کاتەیان هەبێت کە دەیانەوێت بۆی بگەڕێنەوە، جیا لەوەش کاتەکەیان دیاری کراوە، هەر لەبەر

ئەوەشە زۆربەی کات پێ ڕاناگەن تەنانەت ماڵئاوایش بکەن."
پاشان کازوو گەرمیپێوێکی زەنگداری لەناو کوپە قاوەکە دانا.
هیرای: "ئەمە چییە؟"
"ئەم گەرمیپێوە زەنگ لێدەدات بەرلەوەی قاوەکەت ساردببێتەوە."
"زۆرباشە تێگەیشتم."

ڕستەی بەرلەوەی قاوەکە ساردببێتەوە هیرای خەمبارکردبوو، بەڵام بە دانانی ئەو گەرمی پێوە لەناو قاوەکەی وای کردبوو دڵەڕاوکێی کەم ببێتەوە هەر چۆنێک بێت، هەموو ئەوەی دەیویست ئەوە بوو داوای لێبوردن لە خوشکەکەی بکات.

ئەو کاتەی هیرای لە خێزانەکەی دوورکەوتەوە کومی ڕاستەوخۆ ببووە بەڕێوەبەری میوانخانەکە، بەڵام کومی خەونی خۆی هەبوو، دەیویست خوشکەکەی بگەڕێتەوە و ئازادبێت و لە بواری تردا کاربکات، هەر بۆیە ئەم بڕیارەی خوشکەکەی بە خۆپەرستانە ناوزەند دەکرد کە میوانخانەکەی بەسەر کومیدا بەجێهێشتبوو.

هیرای تاکە هۆکاری گەڕانەوەی ئەوەبوو داوای لێبوردن لە خوشکەکەی بکات لە بەرانبەر ئەو خۆپەرستییەی ئەنجامی دا.

کازوو کوپەکەی دانا لەبەردەم هیرای، پاشان کتریەکەی بەدەستەوە گرتبوو، پێش ئەوەی قاوەکە تێبکات گوتی: "لەبیرت بێت... قاوەکە بخۆرەوە بەرلەوەی ساردببێتەوە."

بەرە بەرە قاوەکەی دەکردە ناو کوپەکەوە، هەڵمی گەرمی بەرزبوەوە، هیرای هەستی بە سەرسوڕان کرد، لەشی سووک دەبوو، هەستی دەکرد لە زەوییەکە بەرز دەبێتەوە، قاوەخانەکە لەبەرچاوی پڕبووبوو لە ئاو، هەر بۆیە چاوەکانی داخست.

یەکەمین جار کە هیرای سەردانی قاوەخانەکەی کرد حەوت ساڵ بەر لە ئێستا بوو، ئەوکاتە تەمەنی تەنها بیست و چوار ساڵ دەبوو. نزیکی سێ مانگ دەبوو فرۆشگا یاخود بارەکەی کردبوەوە. ئێوارەیەکی کۆتایی پایز بوو، لەو کاتەی بە شەقامەکەدا پیاسەی دەکرد و بەناو دراوسێکانیدا دەگەڕا چاوی بە قاوەخانەکە کەوت، هاتە ژوورەوە تێبینی خاتوونە کراس سپییەکەی کرد، ئەوەی سەرنجی ڕاکێشا ئەوەبوو خاتوونەکە کراسێکی تەنکی سپی لەبەردایە لە کاتێکدا کەشەکە بەجۆرێکە زۆرێک لەخەڵکی جلی نیمچە زستانە لەبەردەکەن، بەڵام زۆر بەلایەوە گرنگ نەبوو، چونکە پێی وابوو گەرمایەتی. چووە نزیک مێزی ژمێریارەکە و لە کورسی پێشەوە دانیشت.

چاوی بە قاوەخانەکەدا گێڕا، بەڵام هیچ ئەندامێکی ستافی قاوەخانەکەی نەبینی، لە کاتێکدا هەر کە هاتە ژوورەوە چاوەڕێ بوو دەنگێک پێی بڵێت سڵاو بەخێربێیت، چونکە زەنگی دەرگاکە لێدەدات لەو کاتەی کەسێک بێتە ژوورەوە. بابەتەکەی زۆر جدی وەرنەگرت، چاوەڕوان بوو تاکو کەسێک دەربکەوێت، خاتوونە کراس سپییەکەش بە بێدەنگی پەرتووکەکەی دەخوێندەوە، لەو کاتەدا زەنگی دەرگاکەی بیست کچێکی گەنج کە پێدەچوو لە

قوناغی ئامادەیی دا بێت هاتە ژوورەوە و سلاوی لێکرد: "سلاو بەخێربێیت."

بەو شێوە سلاوکردنەی کچەکە بۆی دەرکەوت شێوازی خزمەتکردنی میوانەکانی قاوەخانەکە شێوازی کلاسیکە، ئەمەش وا دەکات میوانەکان زیاتر هەست بە ئازادی بکەن، هەر بۆیە هیرای جگەرەیەکی پێکرد و چاوەڕێ بوو تاکو کچەکە لە ژوورەکەی دواوە بگەڕێتەوە و داواکارییەکەی وەربگرێت.

لەو کاتەی جگەرەی دووەمی دەکێشا ژنێک لە ژوورەکەی دواوە هاتە دەرەوە کە تەنورەیەکی سپی درێژ و کراسێکی بێجی و بلوسێکی سووری لەبەردابوو، پێدەچوو کچە گەنجەکە پێی گوتبێت کە میوانێکمان هەیە.

ژنەکە هیچ کاردانەوەیەکی ئەوتۆ یاخود هیچ پەلەپەلییەکی ئەنجام نەدا، زۆر بەسادەیی پەرداخێک ئاوی پڕکرد و پاشان لەبەردەم هیرای داینا: "سلاو بەخێربێیت."

ئەگەر میوانێکی تر بوایە چاوەڕێی ئەوەی دەکرد لانی کەم گارسۆنەکە داوای لێبوردنی لێبکات بۆ خاوی خزمەتەکەیان، بەلام هیرای ئەو جۆرە وردەکارییانەی هیچ بەلاوە گرنگ نەبوو.

لە دوای ئەو کاتەوە هیرای هەموو ڕۆژێک سەردانی قاوەخانەکەی دەکرد لە زستاندا، بەوەی زانی دەتوانرێت گەشتی کات ئەنجام بدرێت لەنێو قاوەخانەکەدا، سەرنجی ئەوەی دابوو خاتوونە کراس سپییەکە هەمیشە بە نەعلەوە لە قاوەخانەکەیە، پرسیاری ئەوەی کردبوو کە ئایا سەرمای

نییە، بەڵام کی ئەوەی بۆ ڕوونکردبووەوە کە هۆکاری ئەو شێوە دەرکەوتنەی خاتوونەکە چییە. پاشان پێی گووتبوو ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت بگەڕێنەوە ڕابردوو دەبێت لەسەر ئەو کورسییە دابنیشن.

سەرەتا باوەڕی بە هەموو ئەم قسانە نەدەکرد، بەڵام دوای شەش مانگ ئەوەی بۆ دەرکەوت کە قاوەخانەکە بەو ئەفسانەیە بەناوبانگە. لە دوای ئەو ڕۆژە درکی بەوە کردبوو کە دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ڕابردوو، بەڵام تا ئەو کاتە هیچ هۆکارێکی نەبوو تاکو گەشتی کات ئەنجام بدات، چونکە دەیگوت هیچ شتێکم نییە لێی پەشیمان ببم و ئەگەر گەڕانەوە بۆ ڕابردوو هیچ لە ئێستا نەگۆڕێت کەواتە بۆچی بگەڕێمەوە؟

بیرکردنەوەی بەو جۆرە بوو، تا ئەو کاتەی کومی لە ڕووداوی هاتوچۆکە کۆچی دوایی کرد.

هیرای چاوی کردەوە، تێبینی دەنگی کی کرد کە بانگی دەکات، فوساجیش وەکو هەمیشە لە کورسی لای دەرگاکە دانیشتبوو، بەبیری هاتەوە ئەو ڕۆژەیە کە کومی هێشتا زیندووە.

تا دەهات لێدانی دڵی زیادی دەکرد، چاوەکانی زیاتر سووردەبوونەوە لەبەر گریان، دەستی لەسەر دڵی دانا بە ئومێدی ئەوەی لێدانەکەی ئاسایی ببێتەوە، چونکە نەیدەویست کومی بەو جۆرە بیبینێت.

کی بە سەرسوڕمانەوە: "سڵاو..."

پێشوازییەکەی کی بەو جۆرە نەبوو کە ئاخۆ ئەمە هیرای دەناسێت، بەڵکو وەکو کەسێک مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد کە یەکەمین جاری بێت سەردانی قاوەخانەکە بکات، دواتر پرسیاری لێکرد؛ "ئایا تۆ لە داهاتووەوە هاتوویت؟"

"بەڵێ".

"بەڕاست بۆچی؟"

کی هیچ بیرۆکەیەکی نەبوو ئاخۆ بۆچی هاتووە، هیرای؛ "هاتووم تاکو خوشکەکەم ببینم." هیرای لە بارودۆخێکدا نەبوو درۆ بکات.

"ئەو کەسەی کە هەمیشە زۆری لێدەکردیت تاکو بگەڕێیتەوە ماڵەوە؟"

"هەر لەبەر ئەوەیە".

کی؛ "باشە هەرگیز هەوڵت نەداوە چارەسەری بکەیت؟"

"ئەمڕۆ نا چونکە دەیبینم."

هەرچەندە هەوڵی دەدا بە زەردەخەنەکەی دڵتەنگییەکەی بشارێتەوە، بەڵام نەیدەتوانی، هەر لەبەر ئەوەش کی هەستی بەوە کردبوو کێشەیەک لە ئارادایە.

کی بە چپەوە پرسی؛ "شتێک ڕوویداوە؟"

سەرەتا وەڵامی نەدایەوە، دواتر بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی؛ "نەخێر، هیچ نییە."

هیرای ئامادەبوو نهێنییەکەی بشارێتەوە وەک لەوەی بۆ کەسێکی نەناسراوی باس بکات، چونکە متمانەکردن بە کەسانی

نەناسراو کارێکی قورسە، کی لە پشتی مێزی ژمێریارەکەوە هات بۆ لای هیرای پاشان زەنگەکە لێدرا.

کی قسەکەی بەرەو ڕووی دەرگاکەبوو، گوتی: "سلاو بەخێربێیت."

هیرای دەیزانی ئەوەی دێتە ژوورەوە کومی-یە. لە کاتژمێرەکەی ناوەڕاستدا کاتژمێر سێ بوو، هیرای-ش ئەوەی دەزانی کە تەنها ئەو کاتژمێرەیان ڕاستەکەیە، چونکە هەمان کات بوو کە سێ ڕۆژ بەر لە ئێستا کومی سەردانی قاوەخانەکەی کردبوو.

لەو ڕۆژەدا هیرای خۆی لە پشتی مێزی ژمێریارەکە شاردبووەوە، چونکە ئەوە تاکە ڕێگای ئەو بوو بۆ دەربازبوون لە خوشکەکەی، قاوەخانەکە تەنها یەک دەرگای هەبوو بۆ هاتنە ژوورەوە و چوونە دەرەوە، هەموو ڕۆژ هیرای دوای نانخواردنی نیوەڕۆ سەردانی قاوەخانەکەی دەکرد و قاوەیەکی لەگەڵ کی-دا دەخواردەوە، پاشان دەچووە سەرکار. بەڵام ئەو ڕۆژە لەبەرئەوەی بڕیاری دا بوو زووتر بارەکە بکاتەوە زووتر چووە قاوەخانەکە، ئەو ڕۆژە کە دەیویست پارەی قاوەکە بدات و بچێتە دەرەوە گوێبیستی دەنگی خوشکەکەی بوو کە لە پلیکانەکان دەهاتە ژوورەوە، بۆیە بەپەلە چووە پشتی مێزی ژمێریارەکە و خۆی شاردەوە.

بەڵام ئێستا هیرای لەسەر کورسییەکە دانیشت و چاوەڕێی کومی بوو، بەڵام تەنانەت نەیدەتوانی وێنای ڕووخساری

یاخود ئەو جلانە بکات کە پۆشیویەتی، چونکە ساڵێک دەبوو نەیبینیبوو، ئەو شتەش وای کردبوو زیاتر هەست بەدڵتەنگی بکات وشەرمەزاری بکات لەبەرانبەر ئەو کارەی کە کردوویەتی لە ڕابردوودا.

چاوەکانی پڕبوو بوون، بەڵام نەیدەویست لە پێش چاوی خوشکەکەی بگری، چونکە هەرگیز کومی بەو جۆرە نەیبینیبوو، تەنانەت نەیدەزانی چی ڕوویداوە، هیرای-ش هیچی لە دەست نەدەهات ئاخۆ بە خوشکەکەی چی بڵێت، پڕ بە دڵ دەیویست پێی بڵێت بە ئۆتۆمبێل مەڕۆوە ماڵەوە بە شەمەندەفەر بڕۆرەوە، چونکە تووشی ڕووداوی هاتوچۆ دەبێت، یاخود لانی کەم ئەمڕۆ مەڕۆرەوە ماڵەوە، بەڵام دەیزانی ئەگەر ئەوەش بڵێت ئێستا ناگۆڕێت و ناتوانێت ڕێگری بکات لەمردنی خوشکەکەی.

کومی بەزەردەخەنەوە بەرەو لای خوشکەکەی هات و سڵاوی لێکرد: "خوشکێ؟ (دادە)"

ئەوە دەنگی خوشکەکەی بوو، بیستنی دەنگی کومی وای لێکرد لێدانی دڵی زیاد بکات، ئەو دەنگەی کە جارێکی تر گوێبیستی نەدەبوەوە، چاوی کردەوە کومی لە دەرگاکە دەهاتە ژوورەوە.

"سڵاو..."

دەستی چەپی بەرزکردەوە سڵاوی لە هیرای کرد و نامەیەک بە دەستی ڕاستییەوە بوو، بەڵام کەمێک شڵەژاو دەردەکەوت، هیرای هۆکاری شڵەژانی کومی دەزانی، چونکە ئەوە یەکەمین

جار بوو خوشکەکەی بێتە دیدەنی و بە زەردەخەنە پێشوازی لێبکات، هەموو کات کە کومی دەهات بۆ سەردانیکردنی پەلەی دەکرد لە قسەکردن و بەجێی دەهێشت لە نیوەی قسەکردنەکاندا، بەڵام ئەمجارە زۆر جیاواز لە جارانی تر دانیشتووە و چاوەڕێی دەکات؛ "واو... ئەمرۆ زۆر سەیر دەردەکەویت چی بووە؟"

"مەبەستت چییە؟"

"مەبەستم ئەم چەند ساڵەیە هەرگیز بە ئاسانی نەمدەدۆزیتەوە."

"پێت وایە وابێت؟"

"پێم وایە!"

هیرای توند شانەکانی کومی گرت و گوتی؛ "ئۆو کومی، من داوای لێبوردن دەکەم."

کومی هەستی بە دڵخۆشی دەکرد بەو گۆڕانە لەناکاوەی خوشکەکەی، هەر بۆیە گوتی؛ "هممم، دەتوانم داوی خواردن بکەم؟ دەمەوێت قاوە و تۆستێک و برنج و تورتە داوا بکەم." پاشان بانگی کی کرد لە پشتی مێزی ژمێریارەکە.

کی تەواوی داواکارییەکەی نووسی و پاشان گەڕایەوە چێشتخانەکە. کومی گوتی؛ "دەتوانم لێرە دابنیشم"؟ دواتر کورسییەکەی ڕاکێشا. هیرای بە زەردەخەنەوە گوتی؛ "بێگومان".

کومی لەبەرانبەر هیرای دانیشت. سەرەتا تەنها تەماشای یەکتریان دەکرد، دواتر کومی هەستی بە نائارامی دەکرد لەبەرانبەر ڕەفتارەکەی، هەر بۆیە گوتی؛ "ئەمرۆ زۆر سەیر دەردەکەویت."

"چۆن؟"

"هەست دەکەم تەمەنێکە شتێکمان ئەنجام نەداوە... ئەویش بەم جۆرە دابنیشین و تەماشای یەکتر بکەین..."

"وامان نەکردووە؟"

"کۆتاجار کە هاتم لەبەر دەرگاکە وەستابووم ڕێگەت پێنەدام بێمە ژوورەوەش. تەنانەت ڕاتکرد و بەدواتدا ڕامکرد، بەرلەوەش لە شەقامەکە پەڕیتەوە تاکو بمگریت، بەڵام پێش ئەوەش..."

هیرای؛ "بە ئازاربوو وایە؟"

هیرای لەناخی خۆیدا دانی بە هەموو ڕووداوەکاندا دەنا کە ڕوویاندابوو، ئەو کاتەی لە شوقەکەی بوو گڵۆپەکانی داگیرساندبوو، بەڵام وا خۆی پیشاندەدا کە لەوێ نییە، ئەو کاتەی وا خۆی پیشاندەدا کە سەرخۆشە و خۆی لێ هەڵەکرد و گوتی؛ "تۆ کێیت؟" هەرگیز نامەکانی کومی نەدەخوێندەوە. بەڕاستی دادەیەکی خراپ بوو.

"تۆ بەو جۆرەیت."

"من داوای لێبوردن دەکەم کومی، من زۆر داوای لێبوردنت لێدەکەم."

کومی؛ "ڕاستییەکەم پێ بڵێ چی ڕوویداوە؟"

"مەبەستت چییە؟"

"زۆر بەسەیری هەڵسوکەوت دەکەیت."

کی؛ "وا بیر دەکەیتەوە؟"

"شتێک ڕوویداوە؟"

"نەخێر... بابەتەکە بەو جۆرە نییە."

ڕەفتارە سەیرەکانی هیرای وای لە کومی کرد هەست بکات ئەوە کۆتا چرکەساتەکانی ژیانییەتی، چونکە چاوەکانی سوور هەڵگەڕابوون، بە تەواوی بێهێز و دڵتەنگ دەردەکەوت.

کی؛ "ئەوەش قاوەکەتان...". پاشان قاوەکەی لەسەر مێزەکە دانا. هیرای سەری داخستبوو، کومیش سوپاسی کی کرد؛ "سوپاس".

کی؛ "شایەنی نییە". پاشان بەرەو لای مێزی ژمێریارەکە ڕۆیشت.

بەهۆی دروستبوونی پچڕان لە گفتوگۆکەیاندا هیرای وشە و کردارەکانی بیرچوبووەوە کە دەبوو ئەنجامی بدات، چونکە پێش ئەوەی کومی بگاتە ناو قاوەخانەکە هیرای لە مێشکی خۆیدا خەیاڵی ئەوەی دەکردەوە دوای بینینی خوشکەکەی لەئامێزی دەگرێت و هاواردەکات و پێی دەڵێت تکایە مەمرە.

بەهۆی ئەو پچڕانەی لە گفتوگۆکەدا دروستبوو بوو کومی هەستی بە نائارامی دەکرد، لە نامەکەی دەستی دەردەکەوت کە بە توندی گرتبووی بە دەستییەوە، پاشان تەماشای کاتژمێرەکەی دەکرد پێدەچوو کاتەکەی نزیک بووبێتەوە.

کومی دەیویست داواکارییەکەی بە سادەیی بکات، بەڵام پێدەچوو بەهۆی ئەو شڵەژانەی ڕوویدابوو نەتوانێت بیکات، ئەویش ئەوە بوو کە بڵێت بگەڕێوە ماڵەوە.

زۆرقورسبوو گوتنی، چونکە هەموو جارێک لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا کە هاتبوو بۆ بینینی خوشکەکەی و داوای گەڕانەوەی کردبێت هیرای ڕەتی کردۆتەوە، بۆیە بۆ کومی قورسبوو دووبارە گوێی لە وشەی نەخێربێت، بەڵام هەرگیز کۆڵینەدابوو لە سەردانکردنی خوشکەکەی. لەو ساتەدا کومی چەندێک ئازاری دەچەشت بەهەمان شێوە هیرای-ش ئازاری دەچەشت. کومی ئەمجارەش چاوی بڕییەوە چاوی خوشکەکەی، بەلایەوە گرنگ نەبوو دووبارە ڕەتی بکاتەوە یاخود نا، بەڵام ئامادە نەبوو دەست هەڵبگرێت، هیرای-ش تەماشای نێوچاوی دەکرد و گوتی؛ "باشە من دەگەڕێمەوە ماڵەوە."

بەڵام ئەوە وەڵامێک نەبوو بۆ قسەیەک، چونکە کومی هێشتا هیچی نەگووتبوو".

هیرای دەیزانی قسەکانی خوشکەکەی چین و دەیزانی بە دڵنیاییەوە لێی دەپرسێت؛ "دەگەڕێیتەوە ماڵەوە؟"

کومی سەری سوڕما، هیرای چی دەڵێت؛ "چی؟"

هیرای بە سادەیی وەڵامی دایەوە؛ "باشە من دەگەڕێمەوە بۆ تاکاکورا"

"بەڕاست؟"

هیرای بە شەرمەوە؛ "بەڵام تۆ دەزانیت من زۆر لەکاروبارەکانی ئەوێ نازانم ئێستا".

"ئاساییە، دەتوانیت بەوجۆرەی ڕاهاتوویت کاربکەیت، دایە و بابە هاوکارت دەبن تاکو بەباشی فێرببیت."

"بەڕاست؟"

"بێگومان"

چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسک و ڕووخساری سوورهەڵگەڕا.

"چی بووە؟"

ئەمجارەیان نۆرەی هیرای بوو سەری بسوڕمێت، بەڵام هۆکاری فرمێسەکەکانی کومی دەزانی بەهۆی ئەوەی هیرای دەگەڕایەوە تاکاکورا، کومی ئازاد دەبوو، چیتر ئەو ئەرکە قورسەی لە ئەستۆ نەدەگرت.

لەوکاتەی فرمێسک لە چاوەکانی کومی دەڕژانە خوارەوە گوتی؛ "هەمیشە ئەوە خەونی من بووە."

"خەونەکەت چییە؟"

بەچاوی سوور و پڕ فرمێسکەوە؛ "پێکەوە میوانخانەکە بەڕێوەببەین".

هیرای بیری کەوتەوە ئەو ڕۆژە چی بە کی گووتبوو.

ئەو بێزارم دەکات.

"نامەوێت بیبینم."

"من چەندین جار پێمگوتووە کە نامەوێت بگەڕێمەوە ماڵەوە، بەڵام بەردەوام دێت و بێزارم دەکات."

"نەمەوێت بیبینم..."

"دەتوانم ئەوە لەدەمووچاویدا بخوێنمەوە، ئەو دەیەوێت من بگەڕێمەوە و میوانخانەکە بەڕێوەببەم تاکو بۆخۆی ئازاد بێت."

"هەست دەکەم پەستانم لەسەر دەکات."

"فرێی بدە!"

"دەتوانم وێنای بکەم چی نووسیوە... بەڕاستی ئەوە بۆ من زۆر قورسە، تکایە بگەڕێوە ماڵەوە. ئاساییە بەرەبەرە فێری کارەکان دەبیتەوە."

هیرای هەڵە بوو لەو بیرکردنەوەیەدا، چونکە کومی نەیدەویست ئازاد بێت، بەڵکو دەیویست پێکەوە میوانخانەکە بەڕێوەببەن. ئەو هەمیشە خەونی بوو کە لەژێر چەتری خوشکە گەورەکەیدابێت و بە دادە، دادە بانگی بکات و پێکەوە میوانخانەکە بەڕێوەببەن و دایک و باوکیان دڵخۆشبکەن، چونکە لە ڕابردووشدا کومی وەها بوو، هەمیشە هیرای ببوە پشت و پەنا و دڵسۆز بۆی، هەر بۆیە هەرگیز کۆڵی نەدەدا لە هەوڵدان بۆ گەڕانەوە هیرای. هیرای تەواوی هەستی پەشیمانی ناخی داگرتبوو، دەیویست پێی بڵێت مەمرە تکایە من نامەوێت تۆ بمریت!

هیرای بە دەنگێکی لەرزۆکەوە: "کو-کومی" بەڵام وا پێدەچوو کە کومی گوێی لە دەنگی خوشکەکەی نەبووبێت.

کومی هەستا لەسەر کورسییەکەی و گوتی: "خولەکێک چاوەڕێ بکە دەبێت بچمە دەستشۆرەکە و ئارایشتەکەم نوێ بکەمەوە."

هیرای هاواری کرد: "کومی!

بەو جۆرە بانگکردن بە هاوارەوە زیاتر کومی تووشی

سەرسوڕمان کرد: "چییە؟"

هیرای نەیدەزانی چی بڵێت، چونکە هەرچی گوتبا ئێستای نەدەگۆڕی.

"هیچ نییە، ببورە."

بێگومان هیچ نییە نەبوو، بەڵکو مەڕۆ! مەمرە! ببورە! تکایە لێم خۆشبە! ئەگەر نەهاتیتایە بۆ بینینی من بیگومان نەدەمردی!

زۆر شت هەبوون کە پێی بڵێت و داوای لێبوردنی لێبکات لەبەرانبەریدا، زۆر شت هەبوون کە دەیویست بیڵێت، چونکە زۆر بە بێ باکانە دایک و باوکی بەسەر خوشکە بچوکەکەیدا بەجێهێشتبوو، پاشان میوانخانەکەی بەجێهێشت و کومی ناچاربوو بە تەنها هەموو کارەکان بکات، لەوەش زیاتر لەنێو ئەو خشتە جەنجاڵەی دا دەبوو هەموو دوو مانگ جارێک بێت و سەردانی خوشکەکەی بکات و قایلی بکات بە گەڕانەوە. هەموو هەستە پەشیمانییەکانی هێندە زۆر بوو نەیدەتوانی بە وشە دەریببڕێت، چونکە لەوە تێنەگەیشتبوو دەبێت چی بڵێت، یاخود دەیەوێت چی بڵێت؟

کومیش لای خۆیەوە بیری لە میهرەبانی خوشکەکەی دەکردەوە، دەیویست پێی بڵێت کە ماوەیەکی زۆرە بەو جۆرە میهرەبانییە تۆم نەدیووە، هەر بەڕاستی دەگەڕێیتەوە و لەگەڵمدا میوانخانەکە بەڕێوە دەبەیت؟!

کۆمەڵە هەستێکی زۆر هەبوون لە ناخی هەردووکیاندا هاتوچۆیان دەکرد، بەڵام نەیاندەتوانی وشەکانی ناخیان بۆ

بەکتر دەرببرن، دوای ئەوەی بێدەنگییەکی دوورودرێژ دایگرتن هیرای بێدەنگییەکەی شکاند و گوتی: "سوپاس".

کومی: "بەڵێ، ئەمڕۆ تۆ زۆر بەسەیری ڕەفتار دەکەیت."

هیرای بە زەردەخەنەوە گوتی: "بەڵێ، پێم وابێت وایە."

پاشان کومی بەرەو دەستشۆرەکە ڕۆیشت.

هیرای چاوی لەسەر کومی لانەبرد، تاکو لەبەرچاوان ون بوو، پڕ بە دڵی دەیویست هاوار بکات و ڕێگە لە مردنی خوشکەکەی بگرێت، بەڵام نەیدەتوانی، دەستی کرد بە گریان و وەکو باران فرمێسک لە چاوەکانی دەهاتە خوارەوە.

ئەگەر دەستی بە دەمییەوە نەگرتبایە ئەوا بێگومان کومی گوێی لە دەنگی گریانەکەی دەبوو: "هیرای تۆ باشیت؟"

بیپ بیپ بیپ بیپ بیپ...

دەنگەکە لە کوپە قاوەکەوە دەهات، پێدەچوو نزیک بووبێتەوە لە ساردبوونەوە.

"ئۆو زەنگەکە!"

کی لە بابەتەکە تێگەیشت زەنگەکە تەنها لە کاتێکدا بەکاردەهێنرێت کە سەردانکەرەکە سەردانی کەسێکی مردوو بکات.

ئۆو گیانەکەم...خوشکە بچوکەکەی...

هیرای تەماشای کی کرد، چەندە بە بەزەییەوە تەماشای دەکات بە دڵتەنگییەوە سەری جوڵاند.

کی بە شڵەژانەوە بانگی کرد: "هیرای".

"دەزانم". پاشان کوپە قاوەکەی هەڵگرت؛ "دەبێت قاوەکە بخۆمەوە وایە؟"

کی هیچ قسەیەکی نەکرد، هیرای تەواوی کوپە قاوەکەی بە یەکجار خواردەوە، لە دڵی خۆیدا دەیگووت؛ "هەموو ئەوەی دەمویست بگەڕێمەوە ڕووخساری خوشکەکەم ببینم، بەڵام ئەگەر وا بکەم ئەوا ناگەڕێمەوە."

بەدەم خواردنەوەی قاوەکەوە فرمێسک لە چاوەکانی دەهاتنە خوارەوە. کۆمەڵێک بیرکردنەوە وروژمیان هێنایە ناو مێشکییەوە؛ "بۆچی ئەمە ڕوویدا؟ بۆچی دەبوو بمرێت؟ بۆچی زووتر بڕیاری گەڕانەوەم بۆ ماڵەوە نەدا؟ ساتێک وەستا، پاشان گوتی؛ ناتوانم لەوە زیاتر بخۆمەوە..."

کوپەکەی دانایەوە سەرمێزەکە، دووبارە بیرکردنەوەکانی تێکەڵ بوون. نەیدەزانی چی دەوێت، یاخود بۆچی گەڕاوەتەوە ڕابردوو، هەموو ئەوەی دەیزانی ئەوە بوو کە خوشکەکەی خۆشدەوێت و دەبوو زووتر هەستەکانی بۆ دەرببڕێت.

ئەگەر ئێستا قاوەکە تەواو بکەم ئەوا جارێکی تر خوشکەکەم نابینمەوە، تەنانەت جارێکی تر ناتوانم لەبەرانبەر خوشکەکەم دابنیشم و قاوە بخۆمەوە.

"هیرای!"

"ناتوانم بیخۆمەوە!"

کی بە شڵەژانەوە؛ "تۆ بەڵێنت دا... بەڵێنت بە خوشکەکەت دا کە بگەڕێیتەوە میوانخانەکە."

"گوتت لە لای دەمێنیتەوە."

هیرای خەیاڵی ئەوەی دەکردەوە کە کومی زیندووە و پێکەوە میوانخانەکە بەڕێوە دەبەن.

دەنگی زەنگی تەلەفۆنەکەی ئەو بەیانییە لەمێشکیدا دەزرنگایەوە؛ "بەڵام ئەو ..."

وێنەکەی کومی دەهاتەوە پێش چاوی کە لەبەردەمیدا خەوتبوو، بەڵام لە ڕاستیدا نەخەوتبوو، مردبوو.

باشە کە گەڕایەوە ئێستا دەبێت چی بکات؟ دڵی بە تەواوەتی ڕەتی دەکردەوە بگەڕێتەوە ئێستا، کی-ش لەگەڵیدا دەگریا. کی بە گریانەوە گوتی؛ "بەڵام دەبێت بگەڕێیتەوە، چونکە ئەو کارە ڕۆحی خوشکەکەت ئاسودە دەکات."

"چۆن؟"

"خوشکەکەت زۆر دڵتەنگ دەبێت ئەگەر بزانێت ئەو بەڵێنەی کە پێت داوە تەنها بۆ ئەمڕۆ بووە و نەتبردۆتە سەر، ئەی تۆش پێت وانییە؟"

بەڵێ، کی ڕاست دەکات، کومی پێی گوتم کە ئەوە خەونی ئەو بووە لەگەڵم دا کار بکات و منیش بەڵێنم پێی داوە. ئەوە یەکەمین جار بووە کومی بەو جۆرە دڵخۆشە ببینم. ناتوانم ڕێگە بدەم دووبارە بێ هیوا ببێتەوە لێم، دەبێت بگەڕێمەوە ئێستا، پاشان بگەڕێمەوە بۆ تاکاکورا، تەنانەت ئەگەر کومی-ش مردبێت، چونکە من بە زیندوویی بەڵێنم بە ئەو دا، دەبێت کار بۆ دڵخۆشی ئەو بکەم.

هیرای کوپەکەی هەلگرتەوە دووبارە، بەلام...

دەمەویت جاریکی تر ڕووخساری کومی ببینمەوە، ئەوە کۆتا شتە کە دەمەویت.

بەلام ئەگەر ڕووخساری کومی ببینیایەتەوە ئەوا نەیدەتوانی بگەڕیتەوە ئیستا. ماوەی نیوان ساردبوونەوەی کووپە قاوەکەو خواردنەوەی چەند چرکەیەکی مابوو، پاشان...

کلاک.

لەو کاتەدا گویی لە دەنگی دەرگای دەستشۆرەکە بوو کرایەوە، پیدەچوو کومی بیتەوە بەرەو لای. ئیستا تەواوی کوپە قاوەکەی خواردەوە، هەستی دەکرد لەشی گەرم دادیت و بەرەبەرە لەسەر زەوییەکە بەرزدەبیتەوە، لەو کاتەدا کومی بەرەو لای هات، هیرای بانگی کرد؛ "کومی!"

بەشیک لە ئاگایی هیرای لە ڕابردوودا مابوەوە، کومی بەرەو کورسییەکە هاتەوە، بەلام نەیدەتوانی هیرای ببینیت؛ "دادە؟"

هیرای هیشتا دەیتوانی ڕووخساری کومی ببینیت.

کومی!

ئەمجارە دەنگی هیرای نەگەیشتە لای.

کومیش ڕووی کردە کی و گوتی؛ "ببورە دەتوانیت پیم بلییت خوشکەکەم بۆ کوێ چوو؟"

کی بە زەردەخەنەوە گوتی؛ "بەپەلە ڕۆیشت."

کومی دلتەنگ دەردەکەوت، چونکە دوای ئەو ماوە زۆرە چاوی بە خوشکەکەی کەوت و گفتوگۆی لەگەلدا کرد، بەلام

خوشکەکەی بەبێ ئاگادارکردنەوە بەجێیهێشت.

کی؛ "دڵتەنگ مەبە خوشکەکەت بەڵێنی پێداوە بێگومان جێبەجێی دەکات."

کی تۆ زۆر شیرینیت سوپاس.

کومی بە سەرسوڕمانەوە؛ "بەڕاست؟ کەواتە زۆر باشە من دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە."

کومی!

هیرای هەموو شتێکی دەبینی، بەڵام بە جەستە لەوێ نەبوو، ئەوەی بینی کە کومی چەندە دڵخۆش بوو دوای ئەوەی بەوەی زانی بەڵێنەکەی جێبەجێ دەکات. هەموو شتێک لەبەرچاوی هیرای وەکو فیلمێک دەهات و دەچوو، هیرای گریا و گریا و گریا...

خاتوونە کراس سپییەکە گەڕایەوە لە توالێتەکە و لە پاڵیدا وەستا، کازوو، ناگاری، کۆهتاکی و کی هەموویان لەوێ وەستابوون چاوەڕێ بوون هیرای بگەڕێتەوە ئێستا، ئێستایەک بەبێ کومی.

خاتوونە کراس سپییەکە بەبێ گوێدانە فرمێسکەکانی هیرای؛ "بجوڵێ!"

"ئۆو باشە" پاشان بەپەلە لەسەر کورسییەکەی هەستا.

خاتوونەکە پاڵی بە سینیەکەوە نا کە لەسەر مێزەکەی دانرابوو و دەستی کردەوە بە خوێندەوەی ڕۆمانەکەی وەکو ئەوەی هیچ شتێک ڕووینەدابێت.

هیرای بەپەلە فرمێسکەکانی سڕی و گوتی: "دڵنیانیم ئاخۆ تا چەندماڵەوە پێشوازی لەگەڕانەوەم دەکەن، چونکە لە ئێستادا هیچ دەربارەی کاروبارە نوێیەکان نازانم."

نامەکەی کومی توند بە دەستییەوە گرتبوو.

"ئەگەر بەم جۆرە بگەڕێمەوە ... ئایا هیچ کێشەیەک دروست دەبێت؟"

پێدەچوو هیرای وەکو هەمیشە بەبێ پلان، دەیەوێت بگەڕێتەوە تاکاکورا، خوی هەمیشەیی وەها بوو بەبێ بیرکردنەوە کارەکانی ئەنجام دەدا، گەڕانەوە بۆ تاکاکوراش بەهەمان شێوە بوو چونکە لێرە بارەکە و هەموو شتێکی لە دوای خۆیەوە بەجێدەهێشت.

کی: "دڵنیام هەموو شت باش دەبێت." بەبێ ئەوەی هیچ پرسیارێک لە هیرای بکات دەربارەی گەشتەکەی ڕابردووی، هیرای ٣٨٠ یەنی لەنێو جانتاکەی دەرکرد و دای بەناگاری کە پارەی قاوەکەی بوو، پاشان قاوەخانەکەی بەجێهێشت.

کی بە دوای هیرایدا چووە دەرەوە و گوتی: "ئەوە..."

لەوکاتەدا ناگاری پارەی قاوەکەی دەخستە نێو ئامێرەکە، تەماشای کی دەکرد.

پێم سەیر دەبێت ئەگەر دەست هەڵبگرێت.

دووبارە زەنگی قاوەخانەکە لێیدا.

**تەق-تەق**

## VI
## دایک و منداڵەکە

کاتێک کە وەرزی پاییز دەستپێدەکات و هاوین کۆتایی دێت، وردە مێشوولە دەبنە شاهیدی وەرزەکە. بە هەمان شێوەش لە سەرەتای هاوین تا کۆتایی هاوین جۆرە مێشوولەیەکی تر دەبنە شاهیدی وەرزەکە، لە ئێوارانی شاردا بە ڕوونی گوێت لە دەنگی ئەم مێشوولانە دەبێت، وەک ئەوەی بڵێیت لە ناوەڕاستی دارستانێکدا بیت، هەربۆیە ئەم دەنگە بە ڕوونی دەبیستیت لە نزیک قاوەخانەکەدا، ئەمەش وادەکات دانیشتن لە قاوەخانەکە دڵبەرتر بێت، بەپێی ڕاپۆرتەکانی کەشوهەوا بێت ئەمڕۆ گەرمترین ڕۆژی ساڵ بووە، بەڵام پلەی گەرمی قاوەخانەکە ئاسایی بوو، مرۆڤ هەستی بە گەرمای دەرەوە نەدەکرد.

کازوو ئیمەیڵەکەی هیرای خوێندەوە کە بۆ ناگاری ناردبوو.

دوو هەفتە دەبێت گەڕاومەتەوە تاکاکورا زۆر شت ماوە کە فێرببم. کار لەسەر کەمکردنەوەی فرمێسکەکانم دەکەم، هەرچەندە ئەوە زۆر قورسە بۆ من.

"بێگومان ئەوە بۆ ئەو قورسە..."

هەر یەکە لە کازوو و کی مۆبایلیان نەبوو، چونکە کی مۆبایلەکەی ناگاری بەکاردەهێنا و کازووش زۆر لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا باش نەبوو، هەر بۆیە هەر نامەیەک یاخود ئیمەیڵێک بۆ قاوەخانەکە بهاتایە ڕاستەوخۆ دەگەیشت بە ناگاری. بەڵام هیرای سێ تەلەفۆنی هەبوو، دانەیەک بۆ خێزان، دانەیەک بۆ تایبەت، دانەیەکی تریش بۆ کاروباری میوانەکان. لەنێو مۆبایلە خێزانییەکەیدا ژمارەی خێزانەکەی و کومی هەبوو، دوو ژمارەی تری بۆ زیاد کردبوو ناگاری و قاوەخانەکە.

کازوو بەردەوام بوو لە خوێندنەوەی ئیمەیڵەکە.

هەندێک لە شتەکان سەیرن لەگەڵ دایک و باوکمدا، بەڵام هەست دەکەم باشترین بڕیار دابێتم گەڕانەوە بووە بۆ ماڵەوە. هەرچەندە مردنی کومی زیانێکی گەورەی پێگەیاندین، بەڵام لە هەمان کاتدا بەئاگاهاتنێکی باش بوو بۆمان. دڵنیام ژیانێکی زۆر باشم فەراهەم کردووە. بەهەرحاڵ من دڵخۆشم و زۆرباشم. ئەگەر توانیتان وەرن سەردانم بکەن، هەست دەکەم ساڵ لەخۆیەوە دەڕوات بۆ ڤیستیڤاڵی تاناباتا وەرن، تکایە سڵاوم بگەیەنە بە هەموو لایەک.

"یۆکۆ هیرای".

ناگاری لە چێشتخانەکەوە چاوەکانی تیژکردبووەوە گوێی لە قسەکان دەگرت، لە کۆتاییدا زەردەخەنەیەک کەوتە سەر ڕووخساری، ناگاری یەکێک بوو لەوانەی بە زەحمەت

زەردەخەنە لەسەر ڕووخساری دەبینرا.

کۆهتاکی؛ "ئۆو بەڕاستی زۆر جوانە." بە جلە پەرستارییەکانییەوە دانیشتبوو، کەواتە لەسەر کار گەڕابوەوە؛ "تەماشای وێنەکە بکە." کازوو وێنەکەی پیشانی کۆهتاکی دا کە لەگەڵ ئیمەیڵەکە ناردبووی.

"واو زۆر ناوازە دەردەکەوێت."

"بێگومان!"

لە وێنەکەدا هیرای لەبەردەم میوانخانەکەدا وەستاوە، قژی لە دواوە کۆکردۆتەوە، کیمۆنۆیەکی پەمەیی لەبەردایە وەکو خاوەنی میوانخانەکە دەردەکەوێت.

"دڵخۆش دەردەکەوێت."

"بەڵێ."

هیرای بە جۆرێک زەردەخەنەی کردبوو لە وێنەکەدا وەک ئەوەی لەم دونیایەدا بێکێشەترین مرۆڤی سەرزەوی بێت، باوکی یاسو و دایکی میچاکو لە تەنیشتییەوە وەستاون.

"کومیشی لێیە..." ناگاری ئاماژەی بۆ بەشی دواوەی وێنەکە کرد.

"کومی بەم جۆرە دڵخۆش دەبێت."

کۆهتاکی؛ "بەڵێ، بێگومانم لەوە."

کۆهتاکی مۆبایلەکەی گەڕاندەوە بۆ کازوو، پاشان پرسیاری دەربارەی خاتوونە کراس سپییەکە کرد؛ "ئەو ژنە چی دەکات لەوێ؟"

مەبەستی ژنە کراس سپییەکە نەبوو، مەبەستی فۆمیکۆ بوو کە بەرانبەر ژنەکە دانیشتبوو، پێدەچوو ئەمرۆ ڕۆژی پشووی بێت، چونکە تیشێرتێکی ڕەش و سێ چارەکێکی سپی لەپێدا بوو لەگەڵ جوتێک نەعلدا.

فۆمیکۆ هیچ سەرسامییەکی دەرنەبڕی دەربارەی نامەکەی هیرای، تەنها تەماشای خاتوونە کراس سپییەکەی دەکرد. هەموو وەڵامێکی کازوو بۆ کۆهتاکی ئەوە بوو؛ "منیش بەلامەوە سەیرە."

لە بەهارەوە فۆمیکۆ سەردانی قاوەخانەکە دەکات. لەوکاتەوە فۆمیکۆ بەرانبەر ژنە کراس سپییەکە دادەنیشێت. بێدەنگییەکەی شکاند و گوتی؛ "هممم...ببورە".

"بەڵێ؟"

فۆمیکۆ؛ "شتێک هەیە بێزارم دەکات."

کازوو؛ "چییە؟"

فۆمیکۆ؛ "هەموو ئەم شتانەی کە ڕوودەدەن ئایا دەتوانین بچین بۆ داهاتوو؟"

"داهاتوو؟"

"بەڵێ داهاتوو؟"

کۆهتاکی بە پەرۆشییەوە گوتی؛ "بەڵێ، منیش بەپەرۆش بووم بۆ زانینی ئەوە."

"بەڵێ دەمزانی".

فۆمیکۆ؛ "گەشت کردن بە ڕابردوو و بە داهاتوودا شتێکە کە

دەگونجێت ڕووبدات وایە؟"

کۆهتاکی سەری ڕازیبوونی لەقاند.

فۆمیکۆ: "کەواتە دەگونجێت؟"

کازوو وەڵامی دانەوە: "بەڵێ دەگونجێت."

فۆمیکۆ چووە لای ژنەکە و دەستی لەسەر شانی دانا، ژنەکە چاوەکانی لێزیت کردەوە، بەپەلە فۆمیکۆ دەستی لابرد تاکو جادووی لێنەکات.

کۆهتاکی: "واو".

کازوو بە دڵنیاییەوە بە هەردوو ژنەکەی گوت: "بەڵام تا ئێستا کەس نەچووە."

فۆمیکۆ: "چی؟... بۆچی کەس ئەو کارەی نەکردووە لەکاتێکدا شتەکە دەگونجێت ڕووبدات؟"

فۆمیکۆ پێی وانەبوو ئەو تاکە کەس بووبێت ئەو بیرۆکەیەی هەبووبێت، چونکە لەهەمان کاتی ئەودا کۆهتاکیش هەمان بیرکردنەوەی هەبووە.

فۆمیکۆ تەماشای کازووی کرد، کازوو تەماشای ناگاری کرد، ناگاریش دووبارە بۆ فۆمیکۆ.

"باشە دەتەوێت بچیتە چەند ساڵی تر لە داهاتوودا؟"

وا پێدەچوو فۆمیکۆ پێش وەختە خۆی بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ئامادەکردبێت، بۆیە گوتی: "سێ ساڵی داهاتوو."

کازوو: "دەتەوێت خۆشەویستەکەت ببینیت؟"

دەموچاوی سوور بووەوە لە شەرمدا؛ "باشە... چی دەبێت ئەگەر بمەوێت؟"

ناگاری؛ "پێویست ناکات دەربارەی ئەوە شەرم بکەیت."

"بابەتەکە بەو شێوەیە نییە." پاشان سەری داخست و ناگاری و کۆهتاکی تەماشای یەکتریان کرد بەپێکەنینەوە.

کازوو لە بارودۆخێکدا نەبوو گاڵتە بکات، بەڵکو قسەکانی بە ڕاستی دەکرد.

"ئەوە مەحاڵە؟"

کازوو؛ "نەخێر، مەحاڵ نییە... ئەو جۆرە مەحاڵە نییە کە بیری لێدەکەیتەوە."

"بەڵام؟"

"چۆن دەزانیت سێ ساڵی تر ئەو کوڕە سەردانی قاوەخانەکە دەکات؟"

فۆمیکۆ لەم پرسیارەیان تێنەگەیشت، کازوو؛ "ئەوە دەبینیت؟"

ئەمجارە فۆمیکۆ لە پرسیارەکە تێگەیشت، ئەگەر بچێتە سێ ساڵی داهاتوو چۆن دڵنیادەبێتەوە لەوەی گۆرۆ سەردانی قاوەخانەکە دەکات لەو کاتەدا؟

"ئەمە خاڵە گرنگەکەیە، لێرەدا کاتێک دەچیتەوە ڕابردوو دەتوانیت بە تەواوەتی کاتەکە دیاری بکەیت، بەڵام بۆ داهاتوو هەستەکە نادیارە..."

"داهاتوو بە تەواوەتی نەزانراوە." پاشان کۆهتاکی بەردەوامی

بە قسەکەی دا؛ "دەتوانیت بڕۆیتە داهاتوو بۆ ئەو ڕۆژەی کە هیوای بۆ دەخوازیت، بەڵام ناتوانیت بەدڵنیاییەوە بزانیت ئاخۆ ئەو کەسە لە داهاتوو دەبینیت یاخود نا."

کازوو سەرقاڵی لێکدانەوە کە بوو، ناگاری قسەکەی بۆ تەواوکردن؛ "کەواتە ئەگەر بڕۆیتە داهاتوو لەماوەی نێوان ساردبوونەوەی قاوەکە شانسی بینینی ئەو کەسەی دەتەوێت زۆر کەمە."

فۆمیکۆ بە بێ ئومێدییەوە؛ "کەواتە گەشتکردن تەنها بەفیڕۆدانی کات دەبێت؟"

"بێگومان."

کازوو؛ "پێم وایە..."

تاکە کەس لەو نێوەندەدا قسەی نەدەکرد کازوو بوو، تەنها بیری لە قسەکانیان دەکردەوە و لەگەڵ خۆیدا قسەی دەکرد، کاتێک دەگەڕێیتەوە ڕابردوو ناتوانیت ئێستا بگۆڕیت. گەشت کردن بۆ داهاتووش بەفیڕۆدانی کاتە. کەواتە هەر لەبەر ئەمەیە ڕۆژنامەکان گەشتی کاتەکەی قاوەخانەکە بەبێ سوود لەقەڵەم دەدەن.

ناگاری چاوەکانی زیتکردەوە و گوتی؛ "دەتەوێت چی بزانیت؟ ئەوەی کە ئایا هاوسەرگیریتان کردووە؟"

"بەوجۆرە نییە!"

"هەر زانیم."

فۆمیکۆ؛ "نەخێر! پێم گوتیت بەو جۆرە نییە بابەتەکە."

هەرچەندە فۆمیكۆ وا خۆی دەردەخست وانییە، بەڵام زیاتر دەردەكەوت كە وایە.

بەڵام بەداخەوە نەیدەتوانی گەشت بكات بۆ داهاتوو، هەرچەندە یاسایەكی وامان نەبوو كە بڵێت ئەو كەسەی گەشت دەكات بۆ ڕابردوو شانسی ئەوەی نییە گەشت بكات بۆ داهاتوو، واتە هەر كەسێك تەنها یەک شانسی هەیە بۆ ئەوەی گەشت بكات بە كاتدا.

بەڵام كازوو دەیزانی ئەوە ئاسان نییە بە فۆمیكۆی بڵێت، كازوو ئەوەی دەبینی بە دڵخۆشی فۆمیكۆ چات دەكات. ئەوە یاسایەكە. كازوو تەنها بیری دەكردەوە.

"سڵاو بەخێربێیت!"

فوساجی هاتە ژوورەوە، تیشتێرتە پۆلۆكەی لەبەردا بوو لەگەڵ پانتۆڵە بێجییەكەیدا و جووتێک نەعل. جانتاكەی بەشانەوە بوو، گەرمترین ڕۆژی ساڵبوو، دەسماڵێكی سپی بەدەستەوە بوو كە بەكاری دەهێنا بۆ سڕینی ئارەقەكەی.

"فوساجی!" ناگاری بەو جۆرە بانگی فوساجی كرد، لەباتی ئەوەی وەكو هەمیشە پێی بڵێت؛ سڵاو بەخێربێیت!

فوساجی سەرەتا كەمێك سەرسام بوو، دواتر زەردەخەنەیەكی كرد و لەسەر كورسییە هەمیشەیەكی دانیشت، كۆهتاكی بەرەو لای ڕۆیشت؛ "سڵاو ئەزیزم." چیتر بە فوساجی بانگی نەدەكرد.

"ببورە، ئێمە پێشتر یەكترمان ناسیووە؟"

کۆهتاکی؛ "خۆشەویستم، من هاوسەرەکەتم."

"هاوسەر؟... هاوسەری من؟"

"بەڵێ."

فوساجی؛ "ئەمە گاڵتەیە...وایە؟"

"نەخێر، هەر بەڕاستی من هاوسەری تۆم!"

بەبێ ئەوەی گرنگی بدات بە کاردانەوەی لەبەرانبەری دانیشت و گوتی؛ "لێرەدا دانیشتم هەرچەندە نازانم ئاخۆ پێت خۆش دەبێت."

"ئاساییە لێرە دابنیشم، چونکە من هاوسەری تۆم."

"نەخێر، باش نییە چونکە من تۆ ناناسم."

"کەواتە دەبێت بمناسیت ئەی وانییە؟"

"مەبەستت چییە؟"

"پێم وابێت داواکاری هاوسەرگیرییە؟"

فوساجی هەستی شڵەژان دەکرد تەماشای کازووی دەکرد چاوەڕوان بوو کازوو بێت و لە دەست ئەم ژنە ڕزگاری بکات کە بەرانبەری دانیشتووە.

"تکایە دەتوانیت شتێک لەم ژنە بکەیت؟"

ئەگەر وەکو کەسێکی نەناسراو تەماشات بکردنایە ئەوا بێگومان دوانەیەکی زۆر جوانت دەبینی کە بەرانبەر یەکتر دانیشتبوون، بەڵام ئەگەر لە چاوی فوساجییەوە تەماشات بکردایە ئەوا دەتبینی چەندێک شڵەژاوە.

کازوو؛ "کەمێک شڵەژاو دەردەکەوێت."

"پێت وایە؟"

ناگاری: "پێم باشە بۆ ئەمڕۆ وازی لێبێنین."

هەمان گفتوگۆ چەند ڕۆژێک پێش ئێستا ڕوویدا، ئەو کاتەی کۆهتاکی بەرانبەر فوساجی دانیشتبوو پێی گوت: من ژنی تۆم، بەڵام بە هەمان شێوە فۆساجی سەری سوڕما بوو، دواتر قبوڵی کرد، ئێستاش هەمان شت دووبارە دەبێتەوە، بۆیە تەماشاکردنی گفتوگۆکە بەچێژبوو بۆیان.

لەو گفتوگۆیەیاندا هەریەکەیان باسی یادەوەری خۆی دەکرد، بە نمونە فوساجی باسی ئەوەی دەکرد کە چۆن گەشتی کردووە و گەیشتۆتە ئێرە و ئەوێ، کۆهتاکیش گوێی دەگرت و پاشان دەیگوت: بەڵێ منیش سەردانی ئەو جێیەم کردوە.

کۆهتاکی: "پێم وابێت باشترە گفتوگۆکە هەڵبگرین بۆ ماڵەوە."

پاشان هەستا و چووە کورسی لای مێزی ژمێریارەکە دانیشت.

ناگاری: "دڵخۆش دەردەکەویت لەگەڵ ئەم شتانەدا."

"بەڵێ، پێم وابێت."

بەهۆی پلەی گەرمی قاوەخانەکەوە فوساجی ناچاربوو دووبارە دەمووچاوی بسڕێت. پاشان گوتی: "تکایە قاوەیەک پاشان ڕۆژنامەکەی لە جانتاکەی دەرهێنا و لەسەر مێزەکە داینا.

کازوو: "باشە". پاشان چووەوە چێشتخانەکە، فۆمیکۆ چاوی لەسەر خاتوونە کراس سپییەکە بوو، کۆهتاکیش تەماشای

فوساجی دەکرد و دەستی لەژێر چەناگەی دانابوو، فوساجیش سەری داخستبوو تاماشای گۆڤارەکەی دەکرد.

ناگاریش سەرقاڵی ئامادەکردنی قاوەکە بوو. خاتوونە کراس سپییەکەش سەرقاڵی خواردنەوەی قاوەکەی بوو بە خوێندنەوەی ڕۆمانەکەیەوە، کی لە ژوورەکەی دواوە هاتە ژوورەوە.

کۆهتاکی هەر کە بینی؛ "واو زۆر ناوازە دەردەکەویت."

ناگارێ؛ "تۆ باشیت؟"

ڕووخساری سوور هەڵگەڕابوو.

کازوو لە چێشتخانەکەوە گوتی؛ "ئۆو دادە گیان پێم باشە ئەمڕۆ پشوو بدەیت."

کی بە هەموو توانایەوە هەوڵی دەدا باش دەربکەوێت؛ "نەخێر، من باشم."

کۆهتاکی؛ "تۆ ئەمڕۆ باش دەرناکەویت."

"پێم باشە پشوو بدەیت وانییە؟"

کی؛ "نا من باشم بەڕاستمە."

بەڵام لە تەواوی ڕووخساریدا دەردەکەوت کە باش نییە.

کی هەر لە منداڵییەوە بەدڵێکی لاوازەوە لە دایکبووبوو، لەوەش خراپتر ئەو هەرگیز نەیدەتوانی کارە قورسەکان ئەنجام بدات، تەنانەت ئەو ڕۆژانەشی کە وەرزشیان هەبوو لە قوتابخانە بەشداری نەدەکرد، چونکە نەدەبوو ماندوو ببێت.

هیرای گوتبووی؛ "کی دەبێت بجەنگێت تاکو بە خۆشی بژی."

ئەگەر نەتوانم کارە قورسەکان بکەم ئاساییە، کەواتە نایکەم.

کی هەمیشە بەو جۆرە بوو، ئەو کاتەی کە وانەی وەرزشیان هەبوو دەبوو دابنیشتایە لەسەر کورسییەکەی و نەجولایە، یاخود هەندێک جار تەنها هانی دەدان لە یاریکردندا، کی هەمیشە هاوڕێی هەمووان بوو، کاریگەری لەسەر هەمووان دەبوو.

هەندێک جاریش دەبوو کی لە قوتابخانە دابڕایە بەهۆی دەرمانەکانییەوە، یاخود لە نەخۆشخانە دەمایەوە. تەمەنی حەڤدە ساڵان بوو ئەو کاتەی لە قۆناغی دووەمی ئامادەیی بوو لە نەخۆشخانە دەمایەوە، چێژی لەوە دەبینی قسەی لەگەڵ سەردانکەرەکان و پەرستارەکان دەکرد و لە پەنجەرەکەوە تەماشای خەڵکی دەکرد دێن و دەڕۆن.

ڕۆژێکیان پیاوێکی بینی لەسەر یەکێک لە کورسییەکانی باخەکە دانیشتبوو، لە نوکی پێی تا تەوقی سەری پێچرابووەوە، چاوی لەسەر پیاوەکە لانەدەبرد، نەک تەنها لەبەر ئەوەی بە باندج پێچراوەتەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەش بوو کە پیاوەکە لەوانی تر گەورەتر دەردەکەوت، کاتێک کچەکان لەپاڵیدا دەڕۆیشتن زۆر بچوک دەردەکەوتن بە بەراورد بە ئەو.

هەرچەندە ناشرین بوو، بەڵام کی بە پیاوە مۆمیا کراوەکە بانگی دەکرد.

پەرستارەکە بە کی گوتبوو کە پیاوە مۆمیا کراوەکە بە ڕووداوی هاتوچۆ ئاوای لێهاتووە. لەوکاتەی کە ویستی لە

شەقامەکە بپەڕێتەوە ئۆتۆمبێلێکی بارهەڵگری گەورە بەرەو ڕووی هاتووە و لێیداوە، پاشان هەڵیداوەتە نێو فرۆشگاکەی بەرانبەری، لەو کاتەدا پیاوەکە هەستاوەتەوە بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی لێبێت لە کاتێکدا کەسێکی تر بوایە لەجیاتی پیاوەکە ئەوە مردبوو، بەڵام دوای ئەوە پیاوەکە هەستاوەتەوە بەرەو شۆفێری بارهەڵگرەکە چووە، شۆفێرەکە لێی پرسیوە تۆ باشیت؟ بەڵام پیاوە مۆمیا کراوەکە هەڵیگرتووە و لە ناو ئۆتۆبێلەکە دەریهێناوە، چونکە لەوکاتەدا ئۆتۆمبێلەکە تانکی بەنزینەکەی کوون بووە، پاشان گوتوویەتی پەیوەندی بە ئۆتۆمبێلی فریاگوزارییەوە بکەن.

لە کاتێکدا تەواوی جەستەی خوێنی لێچۆڕاوە، بەڵام بەبێ ئەوەی هیچ ئێسقانێکی بشکێت.

لەدوای بیستنی چیرۆکی پیاوە مۆمیاکراوەکە، کی زیاتر ئاشقی پیاوە مۆمیاکراوەکە بوو، ڕۆژێکیان چووە بەردەمی، هەستی دەکرد بەرانبەر دیوارێک وەستاوە، بێ شەرمانە پێی گوت؛ "پێم وابێت تۆ ئەو پیاوەیت کە دەمەوێت هاوسەرگیری لەگەڵدا بکەم."

ئەوە یەکەمین قسەی کی بوو بۆ پیاوەکە، بەبێ ئەوەی قسەی تری لەبەرانبەر بکات، پیاوەکەش سەرەتا سەری داخستبوو، بەڵام دواتر پێی گوت؛ "ئەگەر ئەوەت بوێت دەبێت لە قاوەخانە کار بکەیت."

سێ ساڵ لە پەیوەندی دا بوون تا ئەو کاتەی تەمەنی کی بووە بیست ساڵ و تەمەنی ناگاری بووە بیست و سێ ساڵ، پاشان چوونە دادگا و هاوسەرگیریان کرد.

کۆهتاکی؛ "ئۆو".

کی پەرداخە شوشەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە، کازوو بەپەلە هات و پارچە شوشەکانی کۆکردەوە؛ "خوشکێ تۆ باشیت؟"

کی دانیشت شوشەکان کۆبکاتەوە؛ "من باشم."

"خوشکێ وازی لێبێنە من کۆی دەکەمەوە."

ناگاری بەبێ ئەوەی هیچ بڵێت تەنها تەماشای دەکردن.

ئەوە یەکەمین جار بوو کۆهتاکی هاوڕێکەی ببینێت لەو بارودۆخە، هەرچەندە ئەو پەرستاربوو، زۆر نەخۆشی دەبینی لەبارودۆخە جیاوازەکاندا.

کۆهتاکی؛ "کی ئازیزەکەم."

فۆمیکۆ؛ "تۆ باشیت؟"

فوساجیش بەرەو لایان هات.

"ببورە".

کۆهتاکی؛ "پێم وابێت دەبێت کی بچێتە نەخۆشخانە."

"نا بەڕاستی من باشم."

"بەلام پێم وابێت باشتر دەبم ئەگەر پاڵبکەوم."

کی هەستی بە سەرسوڕان دەکرد و هەناسەی تەنگ بووبوو، بەرەو ژوورەکەی دواوە ڕۆیشت، ناگاری بەدوایدا

ڕۆیشت؛ "کازوو تکایە ئاگاداری قاوەخانەکە بە."

کازوو؛ "بەڵێ بێگومان."

فوساجی؛ "قاوەیەک تکایە."

"ئۆو ... ببورە".

فوساجی چاوەڕێی دەرفەتی گونجاوی دەکرد تاکو داواکارییەکەی پێشکەش بکات. چونکە پێشتر داوای قاوەی کردبوو، بەڵام بەهۆی بارودۆخەکەوە دەرفەت نەبوو بۆی بهێنن. ڕۆژەکە بەم بارودۆخە ناخۆشە کۆتایی هات.

کی دووگیان بوو، لە کاتی دووگیانەکەی دا دادەنیشت و گفتوگۆی لەگەڵ منداڵەکەی دەکرد، ڕۆژەکەی بەمە دەستی پێدەکرد؛ "بەیانیتان باش."

بە ناگاری دەگوت بابە.

"ئەوە دەبینیت باوکە!"

"باوکم؟"

"بەڵێ!"

"زۆر گەورەیە!"

بەڵێ، ئەو تەنها جەستەیەکی گەورەی نییە، بەڵکو دڵێکی گەورەشی هەیە، زۆر میهرەبانە. بابە خۆشەویستە."

"دایە و بابە ناتوانن چاوەڕوان بن تاکو لەدایک دەبیت."

کی لەکاتی دوگیانییەکەی دا ڕۆڵی هەردوو کارەکتەرەکەی دەبینی و قسەی لەگەڵ منداڵەکەی دەکرد، بووە هەفتەی پێنجەم، کی لەژێر چاودێرییەکی چڕی پزیشکدا بوو، بووە هەفتەی

پێنجەم و منداڵەکە بەرە بەرە پەلەکانی دروست دەبوو، دڵی دەستی بەلێدان دەکرد.

لەماوەی دووگیانییەکەی دا بەهۆی گۆڕانکاری هۆرمۆنەکانییەوە زوو زوو میزاجی تێکدەچوو، تاوێک دڵتەنگ دەبوو، تاوێک توڕە دەبوو، هەندێک جاریش سەرما یاخود گەرمای دەبوو. بەتەواوی هەڵسوکەوتی گۆڕابوو.

تا دەهات بارودۆخی لەگەڵ دووگیانیەکەیدا خراپتر دەبوو. هەفتەی شەشەمی بوو زۆرتر سەردانی پزیشک و نەخۆشخانەی دەکرد و زۆربەی کاتەکانی لە نەخۆشخانە دەمایەوە، تەنانەت وای لێهات پزیشکەکان گوتیان دەبێت هەڵبژاردن بکرێت لەنێوان منداڵەکە و کی دا، چونکە بەهۆی لاوازی دڵییەوە ئەگەری ڕزگارکردنی ژیانی هەردووکیان زۆر لاوازە.

تەنانەت پزیشکەکە ئاماژەشی بەوە دابوو ئەگەر دەیانەوێت کۆتایی بە دووگیانییەکە بهێنن دەبێت هەرچی زووە ئەو کارە ئەنجام بدەن لە نێوان هەفتەی شەش بۆ دوانزەدا.

دوای ئەوەی گەڕانەوە ماڵەوە ناگاری تەواوی قسەکانی بە کی گوت، بەڵام هەموو قسەی کی ئەوە بوو باشە دەزانم، ناگاری گەڕایەوە قاوەخانەکە، دوای داخستنی قاوەخانەکە بەتەنها دانیشتبوو، لەوێدا تاکە دەنگ کە دەهات دەنگی چرکەی کاتژمێرەکان بوو.

لەوکاتەدا زەنگی دەرگاکە لێدرا، بەڵام ناگاری هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو، کۆهتاکی هاتە ژوورەوە بۆ ئەوەی

هەواڵی کی بپرسێت، چونکە لە خەمی ئەودا بوو.

ناگاری تەنها سەرێکی جوڵاند و هیچی نەگووت. کۆهتاکی هەر کە هاتە ژوورەوە؛ "بارودۆخی کی چۆنە؟"

سەرەتا کە دووگیان بوو ڕاستەوخۆ باسی ئەوەی نەکرد کە دووگیانە، بەڵام چەند ڕۆژێک دواتر دەربارەی دووگیانییەکەی دوا. ناگاری ڕاستەوخۆ وەڵامی نەدایەوە، بەڵام دواتر گوتی؛ "ئەو باش دەبێت." کۆهتاکی لەسەر کورسییەکەی نزیک ناگاری دانیشت.

ناگاری؛ "ببورە بێزارمان کردیت."

"پێویست ناکات وا بڵێیت، بەڵام ئایا نابێت ئێستا لە نەخۆشخانە بێت؟"

ناگاری؛ "پێم گووتووە، بەڵام گوێم بۆ ناگرێت."

"بەڵێ، بەڵام..."

ناگاری؛ "من لە دژی ئەوە بووم منداڵی ببێت."

کۆهتاکی؛ "بەڵام هیچ شتێک ڕای ئەو ناگۆڕێت..."

کی گووتبووی من لە دژی منداڵەکەم نەوەک لە نێوانیان هەڵبژاردن بکات. کۆهتاکی نەیدەزانی چی بڵێت.

"ئەوە زۆر قورسە."

کازوو لە ژوورەکەی دواوە هاتە دەرەوە.

کۆهتاکی؛ "کازوو..."

کازوو وەڵامی نەدایەوە، ڕاستەوخۆ ڕووی کردە ناگاری و زۆر دڵتەنگ دەردەکەوت.

ناگاری پرسیاری کرد؛ "ئەو چۆنە؟"

کازوو هیچی نەگووت، کی لە ژوورەکە هاتە دەرەوە بەرەو لای ناگاری، کی هیچی نەگووت، تەنها ڕەنگی سپی هەڵگەڕابوو، ناگاری سەری داخستبوو بەبێ ئەوەی هیچ بڵێت هەردووکیان بۆ ماوەیەک بە بێدەنگی مانەوە.

کازوو گەڕایەوە چێشتخانەکە، سەرقاڵی ئامادەکردنی قاوە بوو، ئاوەکەی گەرم کرد و پاشان کردییە ناو فلتەری قاوەکە، لەبەرئەوەی قاوەخانەکە زۆر بێدەنگ بوو بە ئاسانی دەتتوانی گوێبیستی ئەوە بیت کە چی دەکات.

کی بۆ ناگاری؛ "داوای لێبووردن دەکەم."

ناگاری؛ "دەربارەی چی؟"

"سبەی دەچمە نەخۆشخانە."

"..."

کی بە خەمبارییەوە قسەکانی دەکرد؛ "دەمزانی دەبێت وابکەم، پێشتر وابیرم دەکردەوە کە ئەگەر بچمە نەخۆشخانە جارێکی تر ناگەڕێمەوە، بەڵام ئەمە ئەو بڕیارە بووە کە هەمیشە لێی ترساوم."

ناگاری؛ "دەزانم."

"بەڵام پێم وابێت ناتوانم چیتر بەم جۆرە بەردەوام بم."

ناگاری بەبێدەنگی گوێی دەگرت؛ "زۆر شت هەیە کە جەستەم دەتوانێت هەڵیبگرێت..."

کی دەستی خستە سەر سکی کە چەند ئینجێک گەورە بوو بوو ئێستا، گوتی؛ "پێم وابێت لەدایکبوونی ئەم منداڵە هەموو .... دەبات".

"هەر لەبەر ئەمەشە..."

ناگاری چاوەکانی تیژ کردەوە، هەموو ئەوەی گوتی؛ "باشە، کی ئازیزەکەم..."

ئەوە یەکەمین جار بوو کۆهتاکی بەو جۆرە کی ببینێت بە دڵتەنگی، لەو کاتەدا تێگەیشت کە منداڵەکە چ زیانێک بە کی دەگەیەنێت ئەگەر لەدایک ببێت. جەستەی بەرگەی لە دایکبوونی ئەو منداڵەی نەدەگرت، تەنانەت ئەگەر خۆی هەڵبژاردبا لەباتی منداڵەکە کەس لۆمەی نەدەکرد.

کی؛ "من ترساوم ئاخۆ منداڵەکەم دڵخۆش دەبێت. ئایا منداڵەکەی دایە بەتەنها دەبێت؟ ئایا ئەوە دەتگرییەنێت؟" قسەکانی بۆ منداڵەکە دەکرد وەکو هەمیشە کە دەیکرد؛ "ئەگەر تەنها تۆم هەبێت تۆ لێم خۆش دەبیت ڕۆڵەکەم؟"

گوێی گرتبوو، بەڵام هیچ وەڵامێک نەبوو.

فرمێسک لە چاوەکانی دەهاتە خوارەوە.

"من دەترسم...هەبوونی منداڵێک بۆ من چەندە ترسناکە" ڕاستەوخۆ تەماشای ناگاری کرد؛ "نازانم دەبێت چی بکەم، من تەنها دڵخۆشی منداڵەکەمم دەویست، ئایا ئەوە هێندە زۆرە؟"

ناگاری هیچ وەڵامێکی نەدایەوە.

فلاپ.

خاتوونە کراس سپییەکە پەرتووکەکە داخست کە هێشتا تەواوی نەکردبوو، نێوانە پەرتووکە سوور و سپییەکەی کردە ناو پەرتووکەکە. کی ڕاستەوخۆ تەماشای خاتوونەکەی کرد، خاتوونەکەش تەماشای کردەوە، خاتوونەکە چاوی داخست و کردییەوە، کی هەستی دەکرد ئەو چاوتروکاندنە مانای پەیوەندی کردنە بە شتێکەوە کە پەیوەندی بە کی-یەوە هەیە، پاشان خاتوونەکە بەلای کۆهتاکی و ناگاریدا تێپەڕی و چووە توالێتەکە.

کورسییەکەی- ئەو کورسییە-بەتاڵ بوو.

کی بەرەو کورسییەکە ڕۆیشت و لەوێدا دانیشت، وەک ئەوەی شتێک بانگی بکات، ئەو شتەی کە دەتوانێت بتباتەوە ڕابردوو، پاشان بانگی کازووی کرد؛ "کازوو...ئایا دەتوانیت قاوەیەک دروست بکەیت تکایە؟"

کازوو کە گوێ بیستی قسەکەی بوو کەمێک وەستا، نەیدەزانی چی لە مێشکی کی دا دەخولێتەوە.

ناگاری ئاوڕی دایەوە، کی بینی؛ "هەستە ئەوە تۆ بەجدیتە؟"

کازوو ڕووداوەکانی پێکەوە بەستەوە، ئەو ڕۆژە کۆهتاکی و فۆمیکۆ باسی گەشتکردنیان بۆ داهاتوو دەکرد، هەر بۆیە لە کی پرسی؛ "دەتەوێت سەردانی داهاتوو بکەیت وایە؟"

خەونی فۆمیکۆ زۆر ئاسانتر بوو، دەیویست سەردانی داهاتوو بکات، تاکو دڵنیابێتەوە لەوەی کە ئایا هاوسەرگیری لەگەڵ گۆرۆ دا دەکات، بەڵام کازوو ئەوەی پێ گووتبوو

سەردانییەکەی بێ سوود دەبێت، چونکە هیچ گرەنتییەک نییە بڵێت گۆرۆ سەردانی قاوەخانەکە دەکات سێ ساڵی تر.

"تەنها یەکجار دەمەوێت ئەوە ئەنجام بدەم."

"ئامادە ببە."

"ئەگەر تەنها بۆ یەک خولەکیش بێت بۆ من بەسە..."

ناگاری؛ "هەر بەڕاست دەتەوێت سەردانی داهاتوو بکەیت؟"

"ئەوە هەموو شتێکە کە بتوانم ئەنجامی بدەم..."

ناگاری؛ "بەڵام نازانیت کە دەیبینیت یاخود نا؟"

"..."

ناگاری؛ "گرنگی ئەوە لە کوێدایە ئەگەر بڕۆیتە داهاتوو چاوت پێی نەکەوێت؟"

کی؛ "تێدەگەم، بەڵام..."

کی تەماشای چاوەکانی ناگاری دەکرد، ناگاری نەیدەتوانی هیچ قسەیەک بکات جگە لەوەی کە گوتی؛ "نەخێر."

ناگاری هەرگیز بەرەنگاری کی نەبۆتەوە لە هیچ کارێکدا، هەمیشە پاڵپشتی بووە. تەنانەت ئەو کاتەشی کە دەیویست منداڵەکە بهێڵێتەوە هەر ڕێگری لێنەکرد. بەڵام لە ئێستادا بۆیە لە دژی بوو چونکە بیری لەوە دەکردەوە ئەگەر کی بچێتە داهاتوو منداڵەکە نەبینێت ئەوا ئەو هێزەی ئێستا هەیەتی ئەوەش نامێنێت. کی لە جێگەکەی هەڵنەستا، چونکە ئامادە نەبوو واز لە بڕیارەکەی بهێنێت.

کازوو؛ "پێویستە بزانم دەتەوێت بچیتە چەند ساڵی تر؟"

پاشان کوپەکەی ژنەکەی هەڵگرت کە کەمێک پێش ئێستا قاوەکەی تێدا خواردبووەوە؛ "دەبێت بە دیاری کراوی بزانم چ ساڵێک، ڕۆژ و مانگ و بەروار و کاتژمێرەکەم پێ بڵێیت؟"

ناگاری بە تووڕەییەوە؛ "کازوو!"

بەڵام کازوو هیچ گوێی پێنەدا و بەردەوام بوو؛ "دەمەوێت دڵنیاببمەوە لەوەی کە دەیبینێت..."

"کازوو ئازیزەکەم."

کازوو دڵنیای کردەوە کە منداڵەکەی دەبینێت لە داهاتوودا، هەر بۆیە گوتی؛ "بۆیە دڵتەنگ مەبە باشە."

کی لە مردن نەدەترسا، بەڵکو لەوە دەترسا بمرێت و گەورە بوونی منداڵەکەی نەبینێت. کازووش لەوە دەترسا بەهۆی بڕیارەکەی کی-یەوە ژیانی کی و منداڵەکە بکەوێتە مەترسییەوە و لە کۆتایدا نەتوانن ژیانی هیچ کامێکیان ڕزگار بکەن.

هیوا ڕووی کردە چاوەکانی کی و لە دڵی خۆیدا گوتی؛ لە کۆتایدا دەتوانم منداڵەکەم ببینم.

ئەوە ئەگەرێکی زۆر زۆر کەم بوو کە ڕووبدات و کی منداڵەکەی ببینێت لە داهاتوودا، کی ڕووی کردە ناگاری، بەبێدەنگی وەستابوو، پاشان گوتی؛ "ئەوە بکە کە خۆت دەتەوێ".

کی؛ "سوپاس."

کازوو بەپەلە کوپی ژنەکەی بردەوە چێشتخانەکە و ناگاری لای مێزی ژمێریارەکە وەستابوو، بێ ئەوەی هیچی تر بڵێت، کۆهتاکیش دەستەکانی لەناویەک نابوو نزای دەکرد. ئەوە یەکەمین جار بوو کی کازوو ببینێت لەڕووی ناگاریدا بوەستێت و بەقسەی نەکات، کازوو کەسێکی داخراوبوو، تەنانەت کە چووە زانکۆی تۆکیۆش لە کۆلێژی هونەر هیچ کەسێک نەبوە هاوڕێی، کە دەهاتەوە ماڵەوە دەچووە ژوورەکەی خۆی و سەرقاڵی وێنەکێشان دەبوو.

وێنەکانی کازوو زۆر لەڕاستی دەچوون، هەرچەندە ئەو وێنەیەکی دیاری کراوی نەدەکێشا، بەڵکو هێندەی هەستی بە ئارامی بکردایە دەستی دەدایە وێنە کێشان، دەڵێن هەندێک شت هەیە مرۆڤ ناتوانێت بەچاوی سەر ببینێت، بەڵکو تەنها هەستی پێدەکات، یاخود هەندێک شت هەن مرۆڤ لە ڕێگەی زانین و کارکردن و پەی پێبردن فێری دەبێت.

پابلۆ بیکاسۆ یەکێک بوو لەوانەی کە بە وێنەی ڕەش و سپی دەستی پێکرد، دوای مردنی هاوڕێکەی وێنەکانی کەمێک ڕەنگیان تێکەڵ بوو، ڕەنگی شینی تێکەڵ کرد، بەڵام دواتر کە بووە خاوەنی خۆشەویستێک وێنەکانی ڕەنگاو ڕەنگی زیاتریان بەخۆوە بینی، ئەمەش وەرچەرخانێکی گەورە بوو لە مێژووی خۆیدا، دواتریش دەستی کرد بە کێشانی وێنە شێواوەکان کە بەناوبانگترینیان خاتوونە گریاوەکە و گوێرنیکا بوو. هەرچەندە کازوو سەرسامی کارەکانی پابلۆ بوو، شێوازی وێنەکێشانی

لەگەڵ ئەودا یەکیان دەگرتەوە، بەلام کازوو بیری لەوە نەکردۆتەوە چالنجی خەڵک بکات، یاخود ڕای خەڵک وەربگرێت، کازوو بیری لە ناوبانگ نەدەکردەوە، ئەو بەو جۆرە ئارام بوو کە بە ئاسایی وێنەکانی بمێنێتەوە لەنێو خەڵکیدا.

بەهۆی سارد و سڕییەکەیەوە لە دەربڕیندا وای کردبوو کە پەیوەندی لەگەڵ خەڵکدا نەبێت، تەنانەت ئەو کڕیارانەشی کە دەچوونە قاوەخانەکە بە مەبەستی گەڕانەوە بۆ ڕابردوو هەموو قسەی کازوو ئەوە بوو کە پێی دەگووتن؛ "گەڕانەوەت بۆ ڕابردوو هیچ پەیوەندی بە منەوە نییە."

بەلام بارودۆخی کی جیاواز بوو، بەڵێنی بە خۆیدا بوو کە یارمەتی کی بدات لە چوونی بۆ داهاتوو، کی پێی وابوو کازوو هۆکارێکی هەیە وا یارمەتی دەدات بۆ گەشت کردن بۆ داهاتوو، هۆکارەکەشی لە بەرچاو بوو.

"خوشکێ". کی لە دەنگی کازوو چاوەکانی کردەوە، کازوو لە بەردەم مێزەکەی وەستابوو، سینیەکەی بەدەستەوە بوو کە کترییە زیوییەکەی لەسەر بوو لەگەڵ کوپی قاوەکە.

"تۆ باشیت؟"

"بەڵێ، من باشم."

کی خۆی چاککرد و کازوو کوپەکەی لەبەردەم دانا.

کی بیری دەکردەوە بچێتە چەند ساڵی تر لە داهاتوو، دوای کەمێک گوتی؛ "دەمەوێت بچمە دە ساڵی داهاتوو، ٧٢ ی ئاب."

کازوو بە زەردەخەنەیەک وەڵامی دایەوە؛ "زۆرباشە."

ئەو بەرواره بەرواری لە دایكبوونی كی بوو، بەروارێك بوو كە هیچ كام لە كازوو یاخود ناگاری لەبیریان نەدەكرد.

كازوو؛ "كاتژمێرەكە؟"

"كاتژمیر سێی پاش نیوەڕۆ."

"كەواتە دە سالّی داهاتوو، لە ڕۆژی ۲۷ی ئاب كاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆ."

"بەڵێ، تكایە."

كازوو كترییە ئاوە گەرمەكەی گرت بە دەستییەوە؛ "كەواتە زۆرباشە."

كی ڕووی كردە ناگاری و گوتی؛ "دەتبینمەوە."

ناگاری بەبێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە؛ "بەڵێ، باش."

كازوو پارچە فلتەرەكەی لەسەر كووپەكە دانا و بەچپەوە بە كی گووت؛ "قاوەكە بخۆرەوە بەر لەوەی سارد ببێتەوە."

كازوو ئاوە گەرمەكەی كردە ناو كوپەكە، كی بیری لە قسەكانی كازوو دەكردەوە؛ "دڵنیات دەكەمەوە لەوەی ببیبینیت."

هەڵم لە كوپە قاوەكە بەرزبویەوە، دەنگی ئاوەكە تەواوی قاوەخانەكەی تەنیبوو، وردە وردە كی هەستی بە بەرچاو تەڵخی دەكرد و دەست و پێیەكانی گەرم بوون و لە زەوییەكە بەرزدەبوەوە، هەستی ئەوەی هەبوو كە لەسەر هەورەكان دانیشتووە.

سەرەتا وای وێنا دەكرد منداڵێك دەبینێت لە ناو باخێكدا یاری دەكات، بەڵام دواتر ئەو وێنا كردنەشی نەما. باوكی كی-ش بە

هەمان شێوە دڵی لاواز بوو، ڕۆژێک لەو کاتەی لەسەر کار بووبوو کەوتبوو، کی ئەو کات لە پۆلی سێیەم بوو، دوای ئەو ڕۆژە کی-ش ناچار بوو هەمیشە سەردانی نەخۆشخانە بکات، ساڵی دواتر باوکی کی وەفاتی کرد بە نەخۆشییەکە.

بەڵام لەدوای مردنەکەی باوکی، هەستیار بووبوو. تەنانەت لەناو دڵتەنگی و خەمباری خۆیدا نوقم دەبوو، شەوان ئەگەر باوکی بیر بهاتایەتەوە بە خەمبارییەوە نوقمی خەو دەبوو.

کاردانەوەی دایکی تۆماکۆ بۆ مردنی مێردەکەی بە پێچەوانەی کی بوو. تەواوی ڕۆژەکەی بە زەردەخەنە بەسەر دەبرد. چونکە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا دڵخۆش دەرنەدەکەوتن. تاکە ڕۆژ کە تۆماکۆ بۆ مێردەکەی گریابێت تەنها ڕۆژی پرسەکە بوو، لە دوای ئەو ڕۆژەوە بەردەوام خەندە لەسەر ڕووخساری بووە، هەر بەم هۆکارەش کی پرسیاری لە دایکی کرد؛ "بۆچی هێندە دڵخۆش دەردەکەویت؟ ئایا دڵتەنگ نیت؟"

تۆماکۆ لەبەر ئەوەی هەمیشە مردنی بە بۆکسە تاریکەکە ناوزەند دەکرد گوتی؛ "لەبەرئەوەی باوکت ئێستا لەناو بۆکسێکی تاریکدایە پێت وایە ئەگەر بەم جۆرە بمانبینێت چۆن بیردەکاتەوە؟"

تۆماکۆ هەوڵی دەدا ڕاستەوخۆ وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە کە گوتی؛ "ئایا تۆ دڵخۆشیت؟"

"باوکت نەچووە ناو بۆکسەکە بە ویستی خۆی. بەڵکو بە هۆکارێک چووەتە ئەوێ، ئەگەر بتبینێت هەموو ڕۆژێک دەگریت

پێت وایە چۆن بیر بکاتەوە؟ بێگومانم کە دڵتەنگ دەبێت. تۆ دەزانیت باوکت چەندە تۆی خۆش دەویست. پێت وانییە ئەوە ئەو دڵتەنگ بکات کاتێک دەبینێت ئەو کەسەی خۆشی دەوێت دڵتەنگە؟ کەواتە بۆ دڵخۆش نابیت، تاکو هەموو ڕۆژێک باوکت لە بۆکسەکەیەوە بە دڵخۆشی بتبینێت. دڵخۆشی ئێمە وا لە باوکت دەکات دڵخۆش ببێت."

بیستنی ئەم قسانە وای لە کی کرد فرمێسکەکانی چاوی وشک ببنەوە.

دواتر کی لەئامێزگرت و گریا، دوای ئەو هەموو ماوە زۆرەی لە دوای پرسەکەوە هەڵیگرتبوون.

جاری داهاتوو نۆرەی من دەبێت بچمە ناو بۆکسەکە...

کی بۆ یەکەمین جار تێگەیشت کە چەندێک قورس بووە بۆ باوکی. بەهۆی لاوازی دڵییەوە دەیزانی کە لە چ کاتێکدا کۆتایی پێدێت و دەبێت خێزانەکەی بەجێبهێڵێت. بەڵام بە بیرکردنەوە لە قسەکانی دایکی تێگەیشت کە خۆشەویستی بۆ ڕۆڵەکەی و هاوسەرەکەی ڕێگەی پێداوە بەو جۆرە ئەو وشانە لە زاری بێنە دەرەوە.

پاش کەمێک هەموو شتێک لەپێش چاوی ونبوو، دواتر لەشی سووک بوو، پاشان هەستی دەکرد لە ئاستی زەوی بەرز دەبێتەوە، پاشان نیشتەوە لە جێگەکەی خۆی.

سوپاس بۆ کازوو، گەیشت – دە ساڵی داهاتوو.

یەکەمین کار کە کردی بە چواردەوری خۆیدا تەماشای دەکرد، هەموو شتەکانی قاوەخانەکە وەکو خۆیان مابوونەوە، دیوارەکان، گڵۆپەکان، تەنانەت سێ کاتژمێری دیوارەکەش؛ هەموو شتەکان لە جێی خۆیان بوون، هەندێک گۆڕانکاری بچووک ڕوویان دابوو، بەڵام کەسی لێنەبوو پێی بڵێت ئەو لە دە ساڵی داهاتووە.

هەروەها ڕۆژژمێرێک لای ژمێریارەکە دانرابوو لەسەر مێزی ژمێریارەکە ئاماژەی بەوە دەدا کە بەروارەکە ٧٢ی ئابە وەکو کازوو بەڵێنی پێدابوو، لە پشت مێزی ژمێریارەکەوە پیاوێک وەستابوو تەماشای دەکرد.

هەستی بە شڵەژان کرد کە پیاوەکەی بینی، پیاوەکە تیشێرتێکی سپی و چاکەتێکی ڕەشی لەبەردا بوو، بۆینباغی بەستبوو لەگەڵ قژێکی ئاسایی داهێنابوو. هیچ سەرسام نەبوو بەوەی لەپڕدا کێ دەرکەوت لەبەرانبەری، کەواتە پێدەچوو دەربارەی نهێنی قاوەخانەکە بزانێت.

پیاوەکە هەر بەبێدەنگی مایەوە، وا پەرداخێکی بەدەستەوە بوو سەرقاڵی سڕینەوەی بوو، پێدەچوو لە سی یاخود لە چلەکانی تەمەنیدا بێت، کەسێکی ئاسایی دەردەکەوت، جێی برینێک بە لای بڕۆیەوە بوو، تاکو لای گوێی ڕۆیشتبوو.

"همم، ببورە..."

کێ لەو جۆرە کەسانە نەبوو شەرم بکات لە دەستپێشخەری بۆ قسەکردن، گرنگ نەبوو بەلایەوە کەسەکە تازە دەناسێت

یاخود کۆنە، ڕاستەوخۆ بە گفتوگۆیەکی هاوڕێیانە قسەی لەگەڵ کەسەکە دەکرد.

"همم، بەڕێوەبەرەکە لە کوێیە؟"

"بەڕێوەبەر؟"

"بەڵێ، بەڕێوەبەری قاوەخانەکە؟"

پیاوەکە پەرداخەکەی گەڕاندەوە ناو تاقەکە.

"پێم وابێت منم..."

"چی؟"

"ببوورە، کێشەیەک هەیە؟"

"تۆ؟ تۆ بەڕێوەبەریت؟"

"بەڵێ."

"هی ئێرە؟"

"بەڵێ."

"بەڕاست؟"

"بەڵێ."

کی سەری سوڕما، ناکرێت ئەوە ڕاست بێت.

پیاوەکەش بە هەمان شێوە سەرسوڕماو دەردەکەوت، لە پشتی مێزی ژمێریارەکە هاتە دەرەوە و گوتی: "چییە – بەڕاستی کێشەکە چییە؟" ئەوە یەکەمین جار بوو کەسێک سەرسامی خۆی دەرببڕێت دەربارەی ئەوەی کە ئەو بەڕێوەبەرە.

کی هەوڵی دەدا لەوە تێبگات لە ماوەی ئەم دە ساڵەدا چی ڕوویداوە؟ بە مێشکیدا نەدەهات هۆکارەکە چییە. پرسیاری

زۆری هەبوو کە لە پیاوەکەی بکات دەربارەی ڕووداوەکان، بەڵام نەدەیزانی ئاخۆ بڕیارە ڕاستەکە ئەوەیە کە ئەو هەموو پرسیارە لەو پیاوە بکات. سەرەتا هەوڵی دەدا خۆی ئارام کاتەوە.

دەبێت ئارام ببمەوە ...

"هممم ..."

"بەڵێ؟"

" چی دەرباری بەڕێوەبەری پێشوو؟"

"بەڕێوەبەری پێشوو؟"

"پیاوە باڵا بەرزە چاو بچوکەکە..."

"ئۆو ناگاری..."

"بەڵێ!"

لانی کەم پیاوەکە ناگاری ناسییەوە، کەواتە کی هەنگاوێک بەرەو پێشەوە چوو.

"ناگاری ئێستا لە هۆکایدۆیە."

"هۆکایدۆ ... "

"بەڵێ."

بۆ ساتێک بیری لە قسەکەی کردەوە؛ "بۆستە هۆکایدۆ؟"

"بەڵێ."

هەستی بە نائارامی کرد، بابەتەکە وەک ئەوە نەبوو کە پلانی بۆ دانابوو. لەوەتەی ناگاری ناسیبوو هەرگیز باسی هۆکایدۆی بۆ ناکردبوو.

"بەڵام بۆچی؟"

پیاوەکە؛ "باشە ناتوانم وەڵامی ئەمەیانت بدەمەوە."

"ئایا لە پلانت دا هەبوو ناگاری ببینیت؟"

کی بێهیوا بوو لە هەڵە تێگەیشتنی پیاوەکە، چونکە ئەو بۆ ئەو شتە نەهاتبوو. کی هەمیشە بەپێی بارودۆخەکە بڕیاری دەدا چی بڵێت نەوەک قسەی بۆ ئامادە بکات. بۆیە لەبارودۆخێکی وەهادا نەیدەزانی دەبێت چی بکات، پێی وابوو ئەگەر گەشتی داهاتوو بکات منداڵەکەی دەبینێت، پیاوەکە پرسی؛ "هاتوویت تاکو کازوو ببینیت؟"

کی لە کۆتایدا کەمێک هیوای بۆ گەڕایەوە؛ "ئەها!"

چۆن دەبێت ئەو شتە گرنگە لە بیر بکات! ئەوەی یارمەتیدا بۆ گەڕانەوە بۆ داهاتوو کازوو بوو، ئەوەی بەڵێنەکەی پێدا هەر کازوو بوو، گرنگ نییە ناگاری لە هۆکایدۆ بێت کاتێک کازوو لێرە بێت دەتوانێت بابەتەکە چارەسەر بکات.

بەپەلە پرسی؛ "چی دەربارەی کازوو؟"

"چی؟"

"کازوو! ئایا کازوو لێرەیە؟"

ئەگەر پیاوەکە کەمێک نزیک تر بوەستایە بەدڵنیاییەوە کی یەخەی توند دەگرت. توڕەبوونەکەی وای لە پیاوەکە کرد هەنگاوێک بچێتە دواوە.

"لێرەیە یاخود نا؟"

"هممم... سەیرکە".

پیاوەکە کەمێک بیری لە قسەکەی کردەوە، پاشان گوتی؛ "ڕاستییەکە ئەوەیە کە ... کازووش لە هۆکایدۆیە."

"ئای خودایە کازووش لێرە نییە؟"

پیاوەکە سەرنجی کی دەدا کە چۆن هیوا لە ڕووخساری بڕا؛ "تۆ باشیت؟"

کی بە نا ئومێدییەوە تەماشای پیاوەکەی کرد، وەک ئەوەی بڵێت هێندە بەس نییە؟ بەڵام نەیدەزای چی بکات دەربارەی بارودۆخەکەی.

"بەڵێ، من باشم."

پیاوەکە گەڕایەوە پشتی مێزی ژمێریارەکە، کی دەستی گرت بە سکییەوە، بیری دەکردەوە ئەگەر ئەو دووانە لە هۆکایدۆ بن کەواتە وا پێدەچێت منداڵەکەشیان لەگەڵدا بێت.

کی تەنها بیری دەکردەوە، نەیدەتوانی چی بکات، لەو کاتەدا ئەوەی بە مێشکدا هات ئەگەر چوونە داهاتوو ئاسانتر بووایە ئەوا خەڵک زیاتر دەچوونە داهاتوو.

بۆ نموونە ئەگەر فۆمیکۆ و گۆرۆ بەڵێنیان بە یەکتر بدایە سێساڵی داهاتوو یەکتر دەبینن ئەوا بێگومان گۆرۆ بەڵێنەکەی بەجێ دەهێنا، بەڵام لەو نێوەندەدا کۆمەڵێک شت هەبوو کە دەکرا ڕووبدات، بۆ نموونە گۆرۆ لە ڕێگەی دا بۆ ئێرە ڕەنگە دوابکەوێت، یاخود لە ترافیک بمێنێتەوە، یان ئاڕاستەکەی لێ هەڵە ببێت و بچێتە جێگەیەکی تر، یاخود ئەو ڕۆژە لە خەو بمێنێتەوە، یان بەروارەکە لەبیر بکات و نەیەت. بە واتایەکی تر داهاتوو شتێکە ناکرێت لێی دڵنیابین.

بەو پێیە بێت ئەگەر ناگاری و کازوو چووبن بۆ هۆکایدۆ ئەوە ئێستا بە نزیکەی هەزار کیلۆمەتریان بڕیوە، تەنانەت ئەگەر لە نیوەی ڕێگاش بە شەمەندەفەر بگەڕێنەوە هێشتا پێ ڕاناگەن و قاوەکە سارد دەبێتەوە بەرلەوەی بگەنەوە.

ئەگەر بگەڕایەتەوە ئێستا هەرگیز نەیدەتوانی ڕێگە لەو ڕووداوە بگرێت کە ڕوویداوە، ئەویش چوونی ئەو دوانەیە بۆ هۆکایدۆ پێی شەرم بوو ئەگەر بگەڕێتەوە بەمجۆرە و منداڵەکەی نەبینیبێت، هەر بۆیە کوپە قاوەکەی هەڵگرت و قومێکی لێ خواردەوە، بەڵام لە لایەکی تر بە خۆی دەگووت هەرگیز پەشیمان نییە لەو بڕیارەی کە داویتی، ئەو دوای شانسی خۆی کەوتووە، هەر بۆیە گەشتی کرد بۆ داهاتوو، بێگومان ئەوانیش هۆکاری خۆیان هەیە بۆ گەشتەکە.

بۆ من ئەم بەڵێنە تەنها چەند خولەکێک لەمەوبەر بووە، ئەوا دە ساڵ دواترە، بەڵام بێ سود بوو... کە دەگەڕێمەوە دان بەوەدا دەنێم کە ئێمە...

کی دەستی برد بۆ شەکرەکە بیکاتە ناو قاوەکەیەوە.

لەو کاتەدا زەنگی دەرگاکە لێدرا، ویستی بڵێت سڵاو بەخێربێیت، بەڵام پیاوەکە پێش ئەو گوتی، هەر بۆیە قسەکەی گەڕاندەوە، پیاوەکە گوتی؛ "ئەوە تۆیت"؟

کچێکی بچووک بوو، وا دەردەکەوت لە قۆناغی ناوەندی بێت، چواردە یاخود پانزە ساڵان دەبوو، جلی هاوینەی لەبەردا بوو؛ بلوسێکی سپی و پانتۆڵێک و پێڵاوێکی هاوینە، قژی لە

دواوە بەستبوو بە قردێلەیەکی سوور.

ئۆو ... ئەم کچەی ئەو ڕۆژەیە.

کی کچەکەی ناسییەوە، ئەوە ئەو کچە بوو کە ئەو ڕۆژە هاتبوو لە داهاتووەوە وێنەیەکی لەگەڵ کی دا گرت، ئەو ڕۆژە کە کچەکە هاتبوو جلی زستانەی لەبەردا بوو، قژی کورتتر بوو، کەمێک جیاوازتر دەردەکەوت. بەڵام کی توانی بە چاوکانیدا کچەکە بناسێتەوە.

کەواتە بەم جۆرە چاومان بەیەکتر کەوتووە.

کی سەرەتا دەستەکانی نایە ناو یەک و لە کچەکەی دەڕوانی، ئاخۆ پێشوازی لە میوانەکە دەکات، دواتر بە کچەکەی گووت؛ "ئێمە وێنەیەکمان پێکەوە گرتووە وایە؟"

بەڵام کچەکە شڵەژا بە قسەکەی.

کچەکە؛ "ببورە باسی چی دەکەیت؟"

کی درکی بەوە کرد ڕووداوی وێنە گرتنەکە دوای ئەم یەکتر بینینە ڕوودەدا؛ "ئۆو نا هیچ نییە لەبیری بکە."

کچەکە هیچ کاردانەوەیەکی تری نەبوو، زەردەخەنەیەکی کرد و چووە ژوورەکەی دواوە.

باشە ئەمە وام لێدەکات هەست بەباشی بکەم.

کی هەستی بە دڵخۆشی دەکرد ئێستا، سەرەتا هەستی بە نائومێدی دەکرد، سەرەتا ناگاری لێرە نەبوو، دواتر کازوو پاشان پیاوەکە هیچ زانیارییەکی پێنەدا، پێی وابوو بەو جۆرە بگەڕێتەوە ئێستا شەرمەزار دەبێت، بەڵام دواتر کە کچەکەی

بینی کەمێک دڵخۆش بوو.

دەستی لە کوپەکەی دا، کوپەکە هێشتا گەرمبوو، کەواتە دەبێت ببنە هاورێ لەگەڵ کچەکە، بەر لەوەی قاوەکە سارد ببێتەوە. بەبیرکردنەوە لەو شتەی کە کەسێک بکاتە هاورێی خۆی هی دە ساڵی داهاتووە لێدانی دڵی زیادی کردبوو، بەجۆرێک هەستی دەکرد لە سینەی دیتە دەرەوە.

کچەکە گەڕایەوە ناو قاوەخانەکە.

ئۆهە...

بەروانکەیەکی سووری بەستبوو.

ئەوە بەروانکەکەی منە!

کی لە ئامانجە سەرەکییەکەی دوورنەکەوتبوەوە، بەڵام دەبوو دەربارەی ئەو کچە بزانێت چییە.

پیاوەکە بە کچەکەی گووت؛ "ئەمڕۆ کاری زۆرمان نییە، تەنها یەک میوانمان لێرە هەیە."

بەڵام کچەکە هیچ وەڵامێکی نەدایەوە و لەبەردەم مێزی ژمێریارەکە وەستا. پیاوەکەش هیچ قسەیەکی نەکرد، کچەکە مێزەکەی دەسڕییەوە.

ئۆو ئەو شێوازە!

کچەکە بە هیچ جۆرێک سەری هەڵنەبڕی تەماشای کی بکات، بەڵام کی چاوی لەسەر کچەکە لا نەدەدا، کەواتە ئەگەر ئەم کچە لێرە کار بکات دەکرێت کچی بەڕێوەبەرەکە بێت؟

کی ئەگەرەکانی لێکدەدایەوە لە مێشکی خۆیدا.

بیپ-بیپ-بیپ-بیپ-بیپ-بیپ-بیپ

زەنگی تەلەفۆنەکە لێیدەدا لە ژوورەکەی دواوە.

کێ؛ "من دەبێت..." کێ پێی وابوو دەبێت وەڵام تەلەفۆنەکە بداتـەوە، چونکە وا دەسـاڵ تێپەڕ بـووبـوو هێشتا زەنگی تەلەفۆنەکەیان نەگۆڕیبوو.

ئۆو...وریابە...زۆر نزیک بوو...

یاساکەی شکاند و لەسەر کورسییەکە هەستا، ئەگەر کەمێکی تر بەردەوام بووایە ڕەنگە نەتوانێت بگەڕێتەوە ئێستا. پیاوەکە چووە ژوورەکـەی دواوە بۆ وەڵام دانـەوەی تەلەفۆنەکە، کێ گوێی لە دەنگی بوو کە قسەی دەکرد؛ "ئەلو بەڵێ؟ ئۆو سڵاو! بەڵێ، ئەو...ئۆو وایە باشە. کەمێک بوەستە من بانگی دەکەم..."

پیاوەکە لە ژوورەکەی دواوە هاتە دەرەوە.

هممم؟

پیاوەکە تەلەفۆنەکەی بۆ کێ هێنا.

"تەلەفۆنە".

"بۆ من؟"

"ناگارییە."

هـەر کە گوێی لە نـاوی نـاگاری بـوو بەبێ بیرکردنەوە تەلەفۆنەکەی وەرگـرت؛ "سـڵاو بۆچی لە هۆکایدۆیت؟ بۆم ڕوون بکەرەوە چی ڕووی داوە؟" دەنگی هێندە بەرزبوو لە قاوەخانەکەدا دەنگی دەدایەوە.

پیاوەکە هیچ کـاردانـەوەیـەکـی نـەبـوو، بێدەنگ گـەڕایـەوە چێشتخانەکە.

کچەکەش بە هەمان شێوە بـەردەوام بوو لەو کارەی کە سەرقاڵی بوو پێشتر.

"ئەمە چییە؟ کاتم نییە؟ من ئەو کەسەم کە کاتم نییە!"

"بە ئەستەم دەتوانم گوێم لە دەنگت بێت! چی؟"

قاوەکەی لە ساردبوونەوە نزیک دەبـوەوە، بە دەستێکی وایەری تەلەفۆنەکەی گرتبوو بە دەستەکەی تری تەلەفۆەکەی پێبوو.

وشەکانی ناگاری دووبارە دەکردەوە؛ "کچە گەنجەکە؟ بەڵێ لێرەیە، ئەو کچەی دوو هەفتە بەر لە ئێستا لە داهاتووەوە هاتبوو سەردانی قاوەخانەکەی کرد و وێنەیەکی لەگەڵمدا گرت. بەڵێ، بەڵێ. چییەتی؟" لە کاتی قسەکاندا چاوی لەسەر کچەکە بوو، پێم سەیرە بۆچی کچەکە شڵەژاوە؟ کی بە دەم تەلەفۆنەوە بیری دەکردەوە، بیرکردنەوەکە بێزاری دەکرد، بەڵام هەوڵی دەدا بیری لای ئەو زانیاریانە بێت کە ناگاری پێی دەدات.

"هەر وەک پێم گوتی بە ئەستەم دەتوانم گوێم لە دەنگت بێت ئێ؟ چی؟ ئەو کچە؟"

کچەکەمانە.

لەو کاتەدا کاتژمێرەکە زەنگی کاتژمێر دەی لێدا دە جار.

لەو کاتەدا تێگەیشت کاتژمێر سێی پاش نیوەڕۆ نییە، بەڵکو دەی بەیانییەوە، ئەو کاتەشی کە ئەو دەبێت لە قاوەخانەکە بێت کاتژمێر سێیە.

کچەکە دەستی لەوە هەڵگرت کە سەرقاڵی بوو، کی دووبارە کوپەکەی هەڵگرت تاکو دڵنیابێتەوە لە پلە گەرمی قاوەکە، دەبوو بیخواتەوە بەر لەوەی سارد ببێتەوە.

لای کردەوە تەماشای کچەکەی کرد.

منداڵەکەم...

تەلەفۆنەکەی لەسەر مێزەکە دانا و کەوتە بیرکردنەوەی کچەکەی و قسەکانی تەلەفۆنەکە، ناگاری پێی گووتبوو.

تۆ گەشتت کرد بۆ دە ساڵی داهاتوو، بەڵام ئێستا لە پانزە ساڵی داهاتوودایت، هەردوو ساڵەکە تێکەڵ بوون بۆیە ئەو هەڵەیە ڕوویداوە، دوای گەڕانەوەت لە داهاتوو ئێمە ئەوەمان زانی. ئێمە چووین بۆ هۆکایدۆ بەهۆکارێکی بەپەلە، چونکە هیچ کاتمان نەبووە ئەو کچەی کە دەیبینیت کچەکەمانە، کاتت زۆر نییە تەماشای کچەکەمان بکە و بگەڕێوە ماڵەوە بەپەلە.

دوای ئەو هەموو قسەیە ناگاری خەمی کی بوو، داوای لێکرد بگەڕێتەوە ماڵەوە، ئەوەشی پێگووت ئەو کچەی بەرانبەری کچەکەی خۆیانە. لەوەش زیاتر کی هەستی بە پەشیمانی دەکرد لەبارەی ئەو بیرکردنەوەی پێشووی.

ئەوەی بەلایەوە سەیر بوو ئەوە بوو کچەکە دایکی خۆی نەناسییەوە. هەر بۆیە کی وا بیری کردەوە دەکرێت ئەوە کچی کەسێکی تر بێت، تەنانەت تەمەنەکەشی لەوە گەورتربوو کە دەیویست و هیچ سەرنجێکی کی نەدا کە دایکییەتی. دووبارە کاتژمێرەکە دەستی بە زەنگ لێدان کرد، تیک تۆک...تیک تۆک،

قاوەکە لە ساردبوونەوە نزیک دەبوەوە.

کی دەیویست کۆتا قسەی لەگەڵ کچەکەی بکات و پێی بڵێت؛ دەتوانیت لێم ببوریت کە هێنامیتە دوونیاوە؟

کی پرسیاری لە کچەکە کرد؛ "ناوت چییە؟"

سەرەتا کچەکە بەبێدەنگی مایەوە و سەری داخست، بەڵام دواتر گوتی؛ "میکی..." بە خەمبارییەوە ناوەکەی گووت.

کی دەیویست زۆر پرسیاری تر بکات، بەڵام بە بیستنی دەنگی کچەکەی پرسیارەکانی کەم کردەوە.

"ئۆو میکی ناوێکی خۆشە..."

کچەکە کاردانـەوەی کی بە دڵنەبوو، ڕاستەوخۆ چووە ژوورەکـەی دواوە، پیاوەکە لە چێشتخانەکەوە بانگی کرد؛ "میکی تۆ باشیت؟" بەڵام میکی وەڵامی نەدایەوە.

"سڵاو بەخێربێیت!" ئافرەتێک هاتە ناو قاوەخانەکە بلوسێکی سپی لەبەردابوو لەگەڵ پانتۆڵێکی ڕەش و بەروانکەیەکی سوور، هەناسەبڕکێی بوو. پێدەچوو گەرمای کەشەکە کاری تێکردبێت.

"ئەهە" کی ناسییەوە.

کی ئافرەتەکەی ناسییەوە، ئەوە فۆمیکۆ بوو، کەمێک لاواز بوو بوو.

فۆمیکۆ تێبینی ئەوەی کرد کە میکی لەوێ نییە، گوتی؛ "میکی لە کوێیە؟"

کەواتە فۆمیکۆ دەبێت بەوە بزانێت کە ئەمڕۆ کی سەردانی قاوەخانەکە دەکات. پیاوەکە گوتی؛ "لە ژوورەکەی دواوەیە."

هیچ بیرۆکەیەکی نەبوو چی ڕوودەدات.

فۆمیکۆ؛ "بۆچی؟"

پیاوەکە بە سەرسوڕمانەوە پرسی؛ "چی؟"

فۆمیکۆ بە تووڕەییەوە؛ "ناتوانم باوەڕ بەوە بکەم."

پیاوەکە ئەوەندەی تێگەیشت ڕووداوێکی گرنگی لە دەست چووە، یاخود ئەمڕۆ بۆنەیەک هەیە.

کی بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی؛ "کەواتە تۆ ئاگات لە قاوەخانەکە دەبێت؟"

فۆمیکۆ وەڵامی دایەوە؛ "ئۆو بەڵێ،" ڕاستەوخۆ تەماشای کی کرد؛ "قسەت لەگەڵ میکی کرد؟"

کی هەستی بە نائارامی دەکرد بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە.

فۆمیکۆ جەختی لە پرسیارەکە کردەوە؛ "قسەیەکی تایبەتت هەیە لەگەڵی؟"

کی؛ "ئۆو، نازانم..."

"من دەچم و بانگی دەکەم."

"باشە." فۆمیکۆ ڕاستەوخۆ بەرەو ژوورەکەی دواوە چوو.

"بۆچی وا دەڵێیت؟"

کی بە خۆی گوت؛ "هێندە بەسە ئێمە یەکمان بینی."

"ئۆ، وەرە."

"پێدەچوو نەیەوێت قسەی لەگەڵدا بکات..."

فۆمیکۆ؛ "دەیەوێت! ماوەیەکی زۆرە چاوەڕێی ئەم ساتەیە..."

"پێم وابوو بوومەتە هۆکاری دڵتەنگییەکی زۆر بۆی."

"منیش پێم وایە..."

کی کوپە قاوەکەی هەڵگرت دووبارە، فۆمیکۆ گوتی؛ "کەواتە دەتەوێت هەروا برۆیت و هەموو شت بەجێبهێڵیت؟"

کی؛ "دەتوانیت پێی بڵێیت من داوای لێبوردنی لێدەکەم..."

فۆمیکۆ؛ "بەڵام ئەوە... پێت وانییە داوای لێبوردن بەس نەبێت بۆ ئەوە، واتە خۆت بە ڕووبەڕوو پێی بڵێیت ئەوە هەڵە نەبووە کە ئەوت هێناوەتە دوونیا؟"

من هێشتا ئەوم نەهێناوەتە دونیا، بەڵام ئەم چرکەیە بڕیارەکە دەدەم بەبێ بیرکردنەوە.

فۆمیکۆ؛ "میکی بانگ دەکەم."

کی وەڵامی نەدایەوە.

"دەچم بانگی دەکەم."

فۆمیکۆ چاوەڕێی وەڵامی کی نەبوو، بەپەلە چووە ژوورەکەی دواوە.

ئۆو من دەبێت چی بکەم؟

کی بەتەنها لە قاوەخانەکە مایەوە، کەوتە بیرکردنەوە، فۆمیکۆ ڕاست دەکات ئەوە قورسە بتوانیت چی بڵێیت.

میکی دەرکەوت؛ فۆمیکۆ دەستی لەسەر شانی دانابوو.

میکی تەماشای زەوییەکەی دەکرد. فۆمیکۆ گوتی؛ "وەرە گیانەکەم ئەم ساتە بەفیڕۆ مەدە."

میکی...

کی دەیویست پڕ بە دەنگی ناوی بێنێت، بەڵام نەیدەتوانی، فۆمیکۆ گەڕایەوە ژوورەکەی دواوە.

میکی بە بێدەنگی تەماشای زەوییەکەی دەکرد.

کی؛ "تۆ باشیت؟"

میکی کەمێک سەری هەڵبڕی؛ "بەڵێ".

"تۆ لێرە کاردەکەیت؟"

"بەڵێ".

میکی زۆر بە سادەیی وەڵامی پرسیارەکانی دەدایەوە، بەجۆرێک سەخت بوو گفتوگۆکە بەردەوامی پێ بدرێت.

کی؛ "ناگاری و کازوو چوون بۆ هۆکایدۆ؟"

"بەڵێ."

'کەواتە تۆ بۆچی لێرەیت؟"

ئۆو...

کی دوای ئەوەی پرسیارەکەی کرد پەشیمان بووەوە، نەدەبوو بیپرسیایە دەربارەی ئەو شتە، دواتر بیری کردەوە پرسیارەکەی کەمێک هەستیار بوو، بەڵام دواتر میکی بە دەنگێکی نەرم وەڵامی دایەوە؛ "وەک دەبینیت من دەبێت لێرە قاوە بۆ میوانەکان ئامادە بکەم."

"قاوە دروست بکەیت؟"

"بەڵێ، وەکو ئەوەی کازوو هەمیشە ئەنجامی دەدات."

"ئۆو."

"ئیشی منە ئێستا."

"بەڕاست؟"

"بەڵێ."

دووبارە میکی سەری داخستەوە بێ ئەوەی هیچ قسەیەکی تر بکات، کی-ش هیچ بیرۆکەیەکی نەبوو چی تر بڵێت، ئەوەی دەیویست لێی بپرسێت ئەوە بوو.

ئایا تۆ لێم دەبووریت لەبەر ئەوەی تۆم هێناوەتە سەر دونیا؟

بەڵام هیچ بیرۆکەیەکی نەبوو ئاخۆ لێی دەبوورێت یاخود نا، چونکە ببوە هۆکاری دڵتەنگی زۆر بۆی.

شێوازی دەرکەوتنی میکی وای لە کی کرد هەست بە لەخۆبایی بوون بکات، دەربارەی هاتنی بۆ داهاتوو، دروستکردنی ئەم بارودۆخە قورسە بۆ میکی.

قاوەکە هێندەی نەمابوو ساردببێتەوە.

باشە من بۆچی هاتم بۆ داهاتوو؟ تەواوی بابەتەکە ئێستا بێ سوودە. هەموو ئەوەی من بۆی هاتبووم دۆزینەوەی میکی بوو. بەڵام هەرچەندە من دەگەڕێمەوە ڕابردوو ئەوە ناگۆڕێت کە میکی دڵتەنگە.

وەکو کۆهتاکی کە گەڕایەوە ڕابردوو، بەڵام نەیتوانی ئەوە بگۆڕێت کە فوساجی ئێستا ئەوی بیرناکەوێتەوە، تەنانەت هیرای-ش نەیتوانی ڕێگە لە مردنی خوشکەکەی بگرێت. بەڵام کۆهتاکی نامەکەی بەدەست هێنا و هیرای-ش خوشکەکەی بینی، لە کۆتایشدا بارودۆخی فوساجی بەرەو خراپتر دەڕوات

و هیرای-ش جارێکی تر ناتوانێت خوشکەکەی ببینێتەوە.

بەهەمان شێوەش بۆ من هەرچەندە هەوڵبدەم ئەو ڕاستییە ناگۆڕێت دوای پانزە ساڵی تر میکی دڵتەنگ دەبێت.

کی کوپە قاوەکەی هەڵگرتەوە، دووبارە گوتی؛ "ناتوانم ڕێگە بە قاوەکە بدەم ساردببێتەوە..."

کاتی گەڕانەوەیە.

بەڵام لەو ساتەدا میکی بەرەو ڕووی هات و کوپە قاوەکەی دانایەوە لەسەر مێزەکە، ڕاستەوخۆ چاوی بڕییە نێو چاوی.

میکی...

کی نەیدەزانی میکی بیر لەچی دەکاتەوە، بەڵام هیچ قسەیەکی نەکرد، تەنها چاوەڕێی کاردانەوەی کچەکەی بوو.

میکی؛ "ئەو کاتەی بە فۆمیکۆت گوت کە نامەوێت چاوم بە... بابەتەکە بەو جۆرە نییە."

کی گوێی شل کردبوو بۆ دانە بە دانەی وشەکانی.

میکی؛ "هەمیشە ویستوومە کە بتبینم و قسەت لەگەڵدا بکەم..."

زۆر شت هەبوو بەهەمان شێوە کی دەیویست پرسیاری لەبارەوە بکات؛ "بەڵام لەو کاتەی کە ڕوویدا نازانم چی بڵێم."

میکی؛ "بەڵام بەڵێ... زۆرجار هەبووە کە دڵتەنگ بووم."

کی کە بیری لە تەنهاییەکەی میکی دەکردەوە هەستی بە دڵتەنگی دەکرد.

ناتوانم ئەو ساتە خەمبارییانەت بۆ بگۆڕم.

"بەڵام..." میکی زەردەخەنە کەوتە سەر لێوانی و گوتی؛ "من زۆر دڵخۆشم کە تۆ منت هێناوەتە دوونیاوە."

هەستی دڵخۆشی وروژمیان کردە ناو دەمارەکانی کی-یەوە، ئەوە یەکەمین جار بوو کچەکەی ببینێت و وای پێبڵێت.

بەڵام...

فرمێسک لە چاوی کی هاتە خوارەوە.

هێنانە دونیای تۆ تاکە شت بووە کە توانیومە بۆتۆی بکەم.

میکی-ش دەستی کرد بە گریان، بەڵام هەردووکیان دەستی یەکیان گرتبوو پێدەکەنین.

"دایکە."

میکی بە دایکە بانگی کرد.

بەڵام من هیچم پێت نەداوە...

کی دەستی بە چاوەکانییەوە گرتبوو دەلەرزی.

"دایکە."

کی درکی بەوە کرد کاتی ماڵئاوایی هاتووە.

"چی؟"

میکی بە زەردەخەنەوە؛ "سوپاس بۆ هەبوونی من، سوپاس..."

"میکی."

"دایکە."

کی ئەمجارەیان لە دڵخۆشیدا لێدانی دڵی زیادی کردبوو، ئەو کچەی کە دەبێتە خاوەنی لەبەردەمیدا وەستاوە.

لە کۆتایدا تێگەیشتم.

ئێستا بۆ کۆهتاکی نەگۆڕا، بەڵام شێوازی مامەڵەکردنی بەرانبەر فوساجی خودکارانە گۆڕی. درێژەی بە ژیانی دا لەگەڵ فوساجی دا، هەرچەندە دەیزانی فوساجی ئەوی لە مێشکدا نەماوە، هیرای دووبارە گەڕایەوە لای خێزانەکەی و پەیوەندی لەگەڵ خێزانەکەی دا نوێ کردەوە، فێری مامەڵەی میللییانە بوو لە میوانخانەکە.

ئێستا ناگۆڕێت.

هیچ لە فوساجی نەگۆڕا، بەڵام کۆهتاکی بەچێژەوە گفتوگۆی لەگەڵدا دەکرد. هیرای خوشکەکەی لەدەست دا، بەڵام بەو ئیمەیڵەی کە ناردی بۆ قاوەخانەکە پێدەچوو دڵخۆش بێت.

ئێستا ناگۆڕێت، بەڵام ئەو دوو کەسە کۆهتاکی و هیرای گەڕانەوە ئێستا بە دڵێکی نوێوە.

کی چاوەکانی لێکنا.

مێشکم لای ئەو شتانە بوو کە ناگۆڕێت و گرنگترین شتم لە یاد کرد.

فۆمیکۆ ماوەی پانزە ساڵە لەگەڵ میکی بووە. ناگاریش وەکو باوکێک لەگەڵیدا بووە و خۆشەویستی پێداوە. کازوو بە میهرەبانییەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، ڕۆڵی دایک و خوشکی گەورەی بۆ دەبینێت. درکی بەوە کرد هەموو ئەم خەڵکە لە چواردەوری میکی-ن بۆ ماوەی پانزە ساڵە کار بۆ دڵخۆشبوونی ئەو دەکەن.

سوپاس بۆ ئەوەی بە سەلامەت و دڵخۆشی گەورەبوویت.

منت زۆر دڵخۆش کرد. هەموو ئەوەی دەمەوێت بیڵم... ئەو هەستەیە کە لەناخمەوە دێت.

"میکی..."

"سوپاس بۆ بوونت."

دوای گەڕانەوە لە داهاتووەوە فرمێسکی خۆشی لە چاوەکانی کی دەباری. ناگاری هەستی بە ئارامی کرد، کۆهتاکیش چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسک.

بەڵام کازوو زەردەخەنەیەکی میهرەبانی کەوتە سەر لێوانی، هەستی دەکرد ڕووداوەکە بەسەر خۆیدا هاتوە.

"بەخێربێیتەوە". ڕۆژی دواتر کی چووە نەخۆشخانە و لە بەهاری داهاتوودا کی منداڵێکی کچی جوانی هێنایە دوونیا.

لە ڕۆژنامەدا دەربارەی ئەفسانە کۆنەکە سەر دێڕێکیان بڵاو کردبوەوە بەم ناونیشانە؛ "لە کۆتایدا گەڕانەوە بۆ ڕابردوو یاخود گەشت کردن بۆ داهاتوو هیچ لە ئێستا ناگۆڕێت، کەواتە گرنگی کورسییەکە چییە؟"

بەڵام کازوو بڕوایەکی تەواوی بەوە هەبوو کە تەنانەت ئەگەر کورسییەکە نەتوانێت ئێستات بۆ بگۆڕێت لانی کەم دەتوانیت دڵت بگۆڕێت، ئەگەر دڵیشت نەگۆڕێت بێگومان هۆکارێکی خۆی هەیە.

هەر بە شێوازە نەرم و نیانەکەی خۆی دەیگوت؛ "قاوەکە بخۆرەوە بەرلەوەی ساردببێتەوە."



**Tanya Haji | تەنیاحاجی**

public channel

**Description**

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و بابەتی جیاواز🤍

ئەم کتێبە لەلایان سارا نامیق کراوە بەpdf

پێویستی بە دوعایە دوعای خێری بۆ بکەن

چەناڵ

https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ کتێب مەینێرە↓

@tanyahaji22

ئەکاونت↓

https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7

Invite Link

ڕۆمانێکە دوای خوێندنەوەی تووشی تێرامانێکی قووڵت دەکات لەسەر ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو، بەڵام پێت دەڵێ؛ گرنگترین سەرمایەی تۆ ئێستایە بەو کەسانەوە کە لە دەورتن و بیانپارێزە، چونکە دواتر حەسرەتی زەردەخەنەیەک بە ڕوویاندا دڵت وێران دەکات.



# Before the coffee gets cold


کتێبخانەی گۆڵدن بووک
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
07701598762 - 07501444434
Golden book   ktebfroshe_warzer
Warzer Book   Ktebfroshe_warzer


نرخ السعر PRICE 5000